مەسعوود محەمەد

# چەند حەشارگەییێکی ڕێزمانی کوردی

1976

له چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

«چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی»

ئەندامی کارای کۆڕ

مەسعوود محەمەد

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا 1976

له کتێبخانەی نیشتمانی بەغدادا

ژمارە 1100 ی ساڵی 1976 ی دراوەتێ

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

«جملة من خفايا قواعد اللغة الكردية»

العضو العامل: مسعود محمد

مطبعة المجمع العلمي الكردي، بغداد 1976

## شلکردنەوەیێکی سەرەتایی

ئاخاوتن بە هۆی ئەوەوە کە بێ خۆپێوەماندووکردن و بەدوادا گەڕان بەسەر زار و زماندا تێدەپەڕێت، دەبێتە کارێکی خۆکردی عادەتیی وەک هەڵستان و گەڕان و خواردن، بۆیە سەرلەبەری یەکچوون دێتە بەر هەست و هۆش و گۆشی مرۆڤەوە. کاتێک فەرق بە ئاسانی و زەحمەتی شوێنە جوداکانی قسەکردن دەکرێت کە بێگانەی زمانەکە خەریکی فێربوونی بێت و وەک منداڵی گاگۆڵەکردوو، هەست بە جێی هەموار و لەمپەر و ئاستەنگانی بکات و جوداوازییان تێبگات.

لەلایەن ئاسانی و زەحمەتیی ئاخاوتنەوە، نموونەی لە ڕێزمان سادەتر، دەربڕینی دەنگەکانە وەک کە کابرایێکی ڕۆژاوایی ناتوانێ دەنگی لامە قەڵەوەکەی ناو وشەی «الله» دەرببڕێت وەیا هەندێک ئاخێوەر دەنگی «ح» دەکەن بە «خ» وەیا دەنگی «ق» دەکەن بە «ک» و هی تریش... هەر لەبیرمە کاتێک ڕادیۆ پەیدا بوو دانیشتوانی ناوچەکانی کوردستانی عیراق کە لە سنووری ئێران نزیکن و لە کۆنەوە دەمیان لە فارسی وەردەدا، گوێیان لە وتووێژی تاران بوو بەو شێوە فارسییە ڕەسەنەی کە لە زاری تارانییەکانەوە دەردێت و هیچ وێچوونێکی نییە لەگەڵ ئەو فارسییە شەقوپەقەی کوردەکانی دیوی کوردستانی عیراق قسەی پێدەکەن، بەلایانەوە وابوو کە خەڵقی تاران نازانن بە فارسیی دروست قسە بکەن و زمانەکە بە خواروخێچی لە زاریانەوە دەرەهێنن، چونکە وایان دەزانی لەهجە فارسیە شکڵ کوردییەکەی خۆیان کە بە ڕاوێژێکی کوردانەی دەردەبڕن هەر خۆیەتی فارسییەکەی ناو گوڵستانی سەعدی و دیوانی حافظ، ئاگایان لەوە نەبوو لەهجەیێکی ئەوان شیعری فارسی پێدەخوێننەوە وەک ئەوە دەبێ کە فارسێک بە لەهجەی خۆی شیعری کوردی بخوێنێتەوە: نە هی خۆیان فارسی دەبێ و نە هی فارسەکان کوردی دەردەچێ.

بەڵێ، بێگومان زەحمەتیی کاروباری زمان هەر لە دەربڕینی دەنگەکانی ئاخاوتنەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە کۆتایی زەحمەتە زۆر ئەستەمەکانی لایەنە یەکجار بزر و وردەکانی ڕێچکۆڵە تاریک و پێچەکەکانی ڕێزمان.

من لەم گوتەیەمدا بەسەر ئاخێوەری عادەتیدا دەکشم و دەری داوێم لە حیسابی ئاسانی و زەحمەتیی دەستوورەکانی ڕێزمان چونکە سەرلەبەری ڕێزمان و کاری تێکهەڵکێش و ئاڵۆزبلۆزی ئاخاوتن و واتادەربڕین چشتێکی بێگانە و نائاشنایە بە لای ئەوەوە، بێگانەیی و نائاشنایەتیشی لە ڕادەیێکدایە چ فەرقێک ناکات لە نێوان ڕاستەشەقامەکان و باریکەڕێگەکانی ڕێزمان بە هۆی ئەوەوە کەوا بەلای ئەوەوە هەموو شەقامەڕێ و باریکەڕێگاکان بەتێکرایی و بێ جوداییکردن لەبەینی سەختی و هەمواریی پێدا تێپەڕینیانەوە یەک چەشمەنداز و یەک مەزرا و یەک گوزەرگە پێکدەهێنن ئەویش زمانە.

کابرایەکی نەخوێندوو کە دەڵێ «شەکر دەکرم» بەلای خۆیەوە شتێکی گوتوە وەک «لێیان بەداوێوە کردم» هەر دووکیان قسەن و لە زارەوە دەردێن.

ئەوەی ڕاستی بێ، لەم نووسینەمدا خوێندەواری عادەتیشم لە حیسابان دەرهاویشتوە، بەو لای خوێندەواری عادەتییەوە ئەو ڕۆشنبیرەشم تێنەخوێندۆتەوە کە دەخلێکی ڕۆشنبیرییەکەی بەسەر ڕێزمانەوە نییە چونکە هەروەک لە باسەکانی سەربە فەلەکدا حیسابێک بۆ ڕۆشنبیری خۆ تەرخان نەکردووی زانستی «فەلەک» ناکرێ هەروەهاش لە باسی وردی ڕێزماندا حیساب بۆ ڕۆشنبیری خۆ تەرخان نەکردووی ڕێزمان ناکرێ.

نووسینەکەم ڕوو لەو ڕێزمانشناسانەش ناکات کە ڕاهاتووی باسە بەرچاو و ناودەرکردوەکانی ڕێزمانن وەک باسەکانی «ناو، ئاوەڵناو - کار، ئاوەڵکار- چاوگ و قەدی کار...» هتاد، کەوا تێکڕایان سەرەتا و ڕووکەشێکی

ڕێزمانن، هێندەش عادەتین لەوانەن لە هەموو زمانێکدا سەرەباسی بێدەمەتەقە بن وەک پێست و گۆشت و ئێسک کە هەموو ئادەمیزاد خاوەن پشکن تێیاندا. بەڕاستی ئەم هاوبەشییەی زمانە جوداکان لە گەلێک سەرەباسی ڕێزماندا یەکێکە لەو هۆیانەی وا دەکا گەلێک لە ڕێزمانشناسەکانمان دەستوورەکانی زمانێکی وەک ئینگلیزی وەیا ڕووسی وەیا عەرەبی بگوێزنەوە بۆ ناو ڕێزمانی کوردی ئیتر وردەوردە لایەنە تایبەتییەکانی کوردیش بخەنە ژێر حوکمی ئەو دەستوورانەوە کە ئەگەر لە سەرەتاوە بە جۆرێکی سەربەخۆ لە ڕێزمانی کوردی تۆژینەوەیان کردبایە هەرگیز بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو ئەو تایبەتیانە بخەنە ژێر حوکمێکەوە کە خزمایەتی نییە لەگەڵیاندا. خواستنەوەی دەستووری زمانی بێگانە وای کرد بەشێک لە ڕێزمانشناسەکان بڵێن هەروەک وشەی are لە ڕستەی we are brave دا پێی دەگوترێ verb to be دەبێ ڕاناوی «ین»ـش لە ڕستەی «ئێمە ئازاین» دا هەر بە verb to be حیساب بکرێت.

من لەم نووسینەمدا نەختێک بەولای باسە بەرچاوەکانی ڕێزمانەوە بۆ ناو هەندێک لە حەشارگەکانی دەستووراتی ڕێزمانی کوردییەوە دەڕۆم کە لە نووسینی لێرە بە پێشەوەدا باسیان نەکراوە، وا بزانم هەستیشیان پێ نەکراوە مەگەر ناوناوەییێک خۆم بە شێوەییێکی خێرا بەسەر بەشێکیاندا تێپەڕیبێتم ئەویش بە پێی داخوازیی ئەو باسەی ڕووی خامەمی لەو حەشارگە کردبێت.

لە کوردیدا تایبەتیی ئەوتۆ هەیە بەر هیچ یەکێک لە دەستووراتی ڕێزمانەکانی دەرەوەی کوردی ناکەوێت، بگرە لە ڕێزمانی کوردیشدا جارێ هیچ دەستوورێکی بۆ دانەندراوە، هێندەش تایبەتی و بێمانەندە ڕەنگە زەحمەت بێ دەستوورێکی ڕاست و ڕەوان و بێگرێی بۆ بدۆزرێتەوە وەک لەم دوو نموونەیەدا هەست بە زەحمەتبوونی دۆزینەوەی دەستوور دەکەین:

1- دەمگرن.
2- دەیانگرتم.

ڕستەی یەکەم «دەمگرن» کاری ئایندە (مضارع)ی تێدا بەکار هاتوە، ڕستەی دوەم «دەیانگرتم» کاری ڕابردووی بەردەوام (ماضي استمراري) تێدا بەکار هاتوە.

تایبەتیە سەیرەکە لەوەدایە: ڕاناوە لکاوەکان کە هی کەسی یەکەمی تاک «م» و کەسی سێیەمی کۆن «ن، یان» لە هەر دوو ڕستەشدا کەسەکەی یەکەم «مفعول» و کەسەکەی سێیەم «فاعل»ـە، زۆر بەسەیری جێگۆڕکێ دەکەن، واتە ڕاناوی «م» کە لە ڕستەی یەکەمدا پێشکەوتوە «دەمگرن» لە ڕستەی دوەمدا پاشکەوتوە «دەیانگرتم»، ڕاناوی «ن»یش کە لە ڕستەی یەکەمدا دواکەوتوە لە ڕستەی دوەمدا دەبێتە «یان» و وەک فاعل دەچێتە ئەو جێگەیەی کە ڕاناوی «م» وەک مفعول گرتبوویەوە.

تا ئێستا تەعلیلێک بە خەیاڵاندا هاتبێ لەم جێگۆڕکێیەدا هەر ئەوەیە بگوترێ ئەو ڕاناوەی بکەوێتە دوای نیشانەی «دە» لەکاری مضارعدا دەبێتە «بەرکار» (مفعول) ئەوەی بشکەوێتە دوایەوە لە ڕابردووی بەردەوامدا دەبێتە «کارا» (فاعل). بەڵام دەبینی ئەم قسەیە بریتییە لە دووبارەکردنەوەی مەتەڵی جێگۆڕکێکە بێ ئەوەی هیچ تەعلیلێک بەدەستەوە بدات وەک ئەوەی بڵێم «بۆیە زەوی شتان بۆ خۆی ڕادەکێشێت چونکە هێزی ڕاکێشانی هەیە» کە ئەمە بە تەواوی وەک ئەوەیە گوتبێتم «بۆیە زەوی شتان بۆ خۆی ڕادەکێشێت چونکە شتان بۆخۆی ڕادەکێشێت».

تاکوو تایبەتیە مەتەڵاوییەکەی نموونەکانی سەرەوە باشتر ڕوون بێتەوە و پتر سەیری بینەر بهێنێتەوە لە هەردوو نموونەدا ڕاناوی کەسی یەکەم دەخەمە دوای نیشانەی «دە»ی مضارعەوە:

1- دەمگرن
2- دەمگرتن

لەم دوو نموونەیەدا ڕاناوەکان لە جێگەی خۆیان ماونەوە، بەڵام لەبەر گۆڕانی صیغەی کارەکە لە مضارعەوە بۆ ڕابردووی بەردەوام لە نموونەی یەکەمدا «بەرکار و کارا - مفعول وفاعل»ن، لە نموونەی دووەمدا (کارا و بەرکار - فاعل ومفعول»ن.

ئەم خۆگۆڕییەی کە ڕاناوەکان لەم نموونەدا دەیکەن یەکێکە لەو تایبەتیانەی زمانی کوردی کەوا نە لە هیچ زمانێکی تردا دیتوومە و نەهیچ تەعلیلێکی ڕێزمانیش تا ئێستا توانیوەتی شێوەی مەتەڵایەتی لەسەر هەڵگرێت.

ئەوەی ڕاستی بێ نەک لە زمانی غەیری کوردی، بگرە لە هەموو لەهجە ئاخاوتنەکانی کوردیش ئەم خۆگۆڕییە پەیدا نابێت هەر چەند شتێکی زۆر بنجی و گرینگیشە لەو لەهجانەی کە ئەم تەرزە ڕستانە لە ئاخاوتندا بەکار دەهێنن چونکە یەکەمیان صیغەی هەرە بنجییەکەی ئایندەیە و دووەمیشیان صیغە هەرە ڕەسەنەکەی ڕابردووی بەردەوامە کە یەکێکە لەچوار صیغە بنجییەکەی ڕابردووی خەبەری بەتێکڕایی. لە جێگەی مناسبی ئەم نووسینەدا بەشێک لە مەتەڵایەتیی نموونەکان هەڵدەهێنرێت و ڕوون دەکرێت...

من کە هاتم سەرەباسەکەم ناونا «حەشارگە» مەبەسم ئەوە بوو لێکۆڵینەوەکەم لە بابەتی ئەوتۆ بێت نەک تەنها لە ڕووی وردییەوە خۆی لە باسەکانی تری ڕێزمان جودا کردبێتەوە، بەڵکوو سەرەڕای وردیی نابەرچاویشی جوداکەرەوەیێکی بێت. نابەرچاویش هەر ئەوە نییە شتە خۆ بزرکردەوەکە پەردەی بەسەردا هەڵکێشرابێت یا خزابێتە تاریکاییەوە:

نەدیترانی شتی بێ سەرپۆش، وەک جووجەڵەی کەو و سوێسکە کە چاو فەرقیان پێ ناکات هەرچەند تێکەڵ بەو بەرد و دارەشن کە وا لەبەر دەست و دەماندان، ئەو نەدیترانەش هەر دەبێتەوە نابەرچاوی وەک ئەو نموونانەی تازەم هێناوە بۆ جێگۆڕکێی ڕاناوەکان کە هەموو کوردێک ڕۆژانە ئەم جۆرە بەکارهێنانەی ڕاناوان بەسەر زاریدا دێت بەڵام زمانشناسەکانیش هیچ هەستێکیان بە گۆڕانی ڕاناوەکان لە فاعلەوە بۆ مفعول نەکردوە، ئەگەر هەستیان پێکردبا جارێکیان خۆیان لێ بەدەنگ دەهێنا و تەعلیلێکیان بۆ پەیدا دەکرد. لەگەڵ ئەمەشدا من لە باسی ڕاناو، ئەمجارەیان، گۆشەی تری وەها شرایەوە دەخەمە بەر نیگای خوێنەرانەوە کەوا هەرگیز بەهیچ جۆرێک قسەی لێ نەکرابێت و خامەی هیچ یەکێک لە نووسەرانی کورد و کوردیی بۆ خوار نەبووبێتەوە، وەک دواتریش بۆت دەردەکەوێ نابەرچاویی ئەو گۆشانە لە نابەرچاویی جووجەڵەی کەو و سوێسکەش پترە چونکە گۆشەی ئەوتۆن وجوودی سەربەخۆیان نییە، بەڵکوو لە ئاکامی بەراوردکردن و بە یەکتر گرتن و لێکدانەوەی ئەوتۆیی وجوود پەیدا دەکەن هەر وەک ئاکامی موعادەلەی ڕیازی بە شێوەی Potential وجوودی هەیە کە لە عەرەبیدا پێی دەڵێ «وجود بالقوة» نەک «وجود بالفعل». کە سرە گەییشتە ئەو باسانەی ڕاناو بۆت معلوم دەبێ چەند نابەرچاو و پشتپەردەن.

وەک دەزانین حەشارگە جێی خۆتێداشاردنەوە وەیا شت تێداشاردنەوەیە، کە جێگاکە لەوانەبوو دەروونی دیار بێت وەیا بە یەکەم نیگا بدیترێت بە حەشارگە ناشێت. باسی ڕێزمانیش کە بە عادەت باسێکی وشکی زانستی دوور لە عاتیفە و ئاراییشت و هاتوچۆی سۆز و دڵ و ئارەزۆی مرۆڤانەیە، نەختێک تەڕایی و تاموشام پەیدا دەکات کە

به هۆی وردپێوی و لێقوولبوونەوەی زیاد لە عادەتەوە هەم مەنزەرگۆڕیی تێدا پەیدا دەبێت و هەم بە ناچاری بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوە لایەنێکی زاتی مرۆڤانەشی تێکەڵ دەبێت چونکە هێنانەوەی تەعلیلی دوورەدەست بۆ مەفهوومکردنی ڕاستیی ورد و شرایەوە سەردەگەیەنێ بە هەڵدانەوەی سەرپۆش لە ڕووی ئەو نیازە نهێنییە بە نەفسدا ڕۆچوانەی لە کۆنەوە وای لە خاوەن زمان کردوە دەستووری لەعادەتبەدەر بۆ دەربڕینی واتای لەعادەتبەدەر پەیدا بکات، ئەمەش ڕاستەوخۆ ڕژانی نەفسە بۆ ناو بابەت.

1- حەشارگەی «ڕاناو»

ڕاناو لە هەموو زماناندا جێگەی قسە لێکردن و لێکۆڵینەوەیە، زۆریشی لەسەر نووسراوە تەنانەت خۆم گوتارێکی 120 لاپەڕەییم لەسەر هەندێ باری ڕاناوی کوردییەوە نووسی، لە بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕدا بڵاو کرایەوە. چی لێرەدا بە لایەنێکی شرایەوەی ڕاناوی کوردی دەهێنرێتەوە پێش نیگای بینەرانەوە گۆشەیێکی زۆر تەسک و بزری ڕاناوە کەوا هەرگیز لێرە بە پێشەوە قسەی لێ نەکراوە، ڕەنگە زیهنی کەسی تریشی بۆ نەچووبێت چونکە هەر کەسێکی باسەکەم لەگەڵدا کردبێتەوە بە تەواوی بۆی نوێ بوە.

لێکۆڵینەوەکەش لە بارەی هەندێ تایبەتیی ئەو بەشەیە پێی دەڵێن «ڕاناوی لکاو» کە تەعبیرێکە یەکسەر لە زاراوەکەی عەرەبی «ضمير متصل»ـەوە وەرگێڕدراوەتە سەر کوردی. من لە گوتارە باسکراوەکەی سەرەوەدا نارەزایی خۆم لەم زاراوەیەی «ڕاناوی لکاو» دەربڕیوە لەو ڕووەوە کەوا تایبەتی و خەسڵەتە یەکجار بێمانەندەکانی ئەو تەرزە ڕاناوەی زمانی کوردی لە بن سێبەری تیری ئەو زاراوە چاوغەڵەتێنەدا دەشرێتەوە و دەورە هەرە گرنگەکەی لە پێکهێنانی ڕستەی واتاداری یەکجارەکی بێنموود دەبێت.

من پێشنیارم ئەوەبوو زاراوەی «ڕاناوی چالاک»ی بۆ بەکار بێت هەر بەو پێیەش زاراوەی «ڕاناوی مەند» بکرێتە جێگری «ڕاناوی نەلکاو» هۆی پێشنیارەکەشم لە گوتارەکەدا ڕوون کراوەتەوە، کەسێک بیهەوێ لە گۆشەی نیگام بگات دەبێ بگەڕێتەوە بۆ خوێندنەوەی گوتارەکە.

وادەزانم باسی ئەم حەشارگەیەش هەر لە بێجێیی و نالەباریی زاراوەی «لکاو - نەلکاو» زیاد دەکات.

با بێینە سەر چەقی باسەکە:

دەزانین ڕاناوی چالاک (لکاو) لە کوردیدا[1] دوو جۆرە:

1- ڕاناوی چالاکی کاری «تێپەڕی ڕابردوو» (ماض متعد)
2- ڕاناوی چالاکی کاری «تێنەپەڕی ڕابردوو» کە هەر خۆیەتی لە کاری ئایندەدا چ تێپەڕ بێت چ تێنەپەڕ.

ڕاناوە چالاکەکانی تێپەڕی ڕابردوو وەک دەزانین ئەمانەن:

- «م» - بۆ یەکەم کەسی تاک وەک: کردم
- «مان» - بۆ کەسی یەکەمی کۆ وەک: کردمان.
- «ت» - بۆ کەسی دووەمی تاک وەک: کردت.
- «تان» - بۆ کەسی دووەمی کۆ وەک: کردتان.
- «ی» - بۆ کەسی سێیەمی تاک وەک: کردی.
- «یان» - بۆ کەسی سێیەمی کۆ وەک: کردیان

ڕاناوە چالاکەکانی تێنەپەڕی ڕابردوو و هەموو ئایندەیێکیش ئەمانەن:

- «م» - بۆ کەسی یەکەمی تاک وەک: هاتم، دێم، دەکەم

[1] - بەڕاستی دەبێ بڵێین لە لەهجە ئاخاوتنی کوردستانی خواروو، چونکە لەهجەی سەروو هەموو ڕاناوە چالاکەکانی تێدا دەرناکەوێت.

- «ین» - بۆ کەسی یەکەمی کۆ وەک: هاتین، دێین، دەکەین
- «یت، ی» - بۆ کەسی دوەمی تاک وەک: هاتیت، دێیت، دەکەیت، یاخود هاتی، دێی، دەکەی،
- «ن» - بۆ کەسی دوەمی کۆ وەک: هاتن، دێن، دەکەن
- کەسی سێیەمی تاک ئەم ڕاناوەی نییە
- «ن» بۆ کەسی سێیەمی کۆ وەک: هاتن، دێن، دەکەن.

سرنجێکی سەرپێیی دەری دەخا کەوا پێنج ڕاناوی کۆمەڵەی یەکەم هەمیشە لەدوا کاری تێپەڕدا دێن، دەشزانین لە ڕووی هێزەوە تێپەڕ لە ژووروویی هەموو کارەکانەوە دێت. لێرەدا دەبێ بە بیر خوێنەری بێنمەوە، کار لە ڕووی هێزەوە سێ پلەی هەیە:

- یەکەم: کاری تێپەڕ کە هێزەکەی تەنها بە «کارا - فاعل» دابین نابێت و «بەرکار - مفعول» داوا دەکات.
- دوەم: تێنەپەڕی عادەتی وەک «هات، چوو، گەییشت، ڕۆییشت، نیشت...» کە لەوێدا کارا بە خواییشتی خۆی کارەکە دەکات.
- سێیەم: تێنەپەڕی هەرە بێهێز کە لە عەرەبیدا پێی دەڵێن «افعال المطاوعة» و من لە کوردیدا پێیان دەڵێم «کاری ڕوودان» کە فاعلەکەیان خواییشتی نییە لەو شتەی ڕوو دەدات. صیغەی هەرە بەرچاوی کوردی بۆ ئەو کارانە ئەوەیە کۆتاییەکەی لە ڕابردوودا بە دەنگی «ا» دێت و لە ئاییندەدا «ا» کە دەبێتە «ێ»، وەک: ترازان، پسان، سووتان، دڕان، لوان، لکان، سوان، کوڵان برژان.. ئەمەش جۆری «تصریف» یانە لە ڕابردووەوە بۆ ئایندە و نیشان دەدات کە ئەلفەکەیان دەبێتە «ێ»:
  - ئێوە - برژان - دەبرژێن - لکان - دەلکێن
  - ئێمە - سووتاین - دەسووتێین - برژاین - دەبرژێین
  - من - ترازام - دە ترازێم - کوڵام - دەکوڵێم

دەنگی ئەلفی کۆتایی کار ئەگەر هی «مطاوعة - ڕوودان» نەبێت لە ئایندەدا بەدیار ناکەوێتەوە چ تێپەڕ بێت چ تێنەپەڕ. نموونەی وەک:

- کێڵام - دەکێڵم - ناگوترێ: دەکێڵێم
- پێواتان - دەپێون - ناگوترێ: دەپێوێن

نموونەی تێنەپەڕی عادەتی وەک:
هەڵستام - هەڵدەستم ناگوترێ: هەڵدەستێم

صیغەی تریش هەیە بۆ کاری ڕوودان بەڵام هێندەی کارە ئەلفییەکان بەرچاو نیین وەک: خشین، لەرزین، بەزین [بە واتای لەشەڕدا هەڵاتن نەک غاردانەی بە ئارەزۆ]، ڕزین، جمین [وەک: ڕێگاکە جمی - واتە هەرەسی کرد].

پێویستە لێرەدا ئەوەش بڵێمەوە [چونکە لە نووسینی ترمدا گوتوومە] صیغەی «کاری کارابزر» (الفعل المبني للمجهول) لە کوردیدا بە تەواوی و لە هەموو ڕوویێکەوە وەک کاری ڕوودانی ئەلفی گەردان دەکرێ و وەک ئەویش ڕاناوی کاری تێنەپەڕی بۆ بەکار دێت چونکە بە ڕاستی ئەویش لەوپەڕی بێهێزیدایە، وەک:

- دیتران، دەدیترێن
- خوراین، دەخورێین
- گیرام، دەگیرێم... هتاد

مەبەست لەم ڕوونکردنەوەیە ئەوەبوو کە بیکەمە پێشەکی بۆ چوونە نێو حەشارگە ڕێزمانییەکەی باس لێکراو:

ڕاناوەکان بەپێی هاتنیان بەدوا کاری ڕابردووی بەهێز و بێهێزدا، خۆشیان دابەش دەکرێن بە چەند بەشێک لە ڕووی هێز و بێهێزییەوە.

- یەکەم: ئەو ڕاناوانەی هەمیشە لە دوا کاری ڕابردووی تێپەڕەوە دێن و هەرگیز ناچنە دواوەی کاری تێنەپەڕ. ئەو ڕاناوانە بریتین لە: مان، ت، تان، ی، یان
- دوەم: ئەو ڕاناوانەی [ڕاست ئەوەیە بڵێم ئەو ڕاناوەی] دەچنە دوای ڕابردووی تێپەڕ و تێنەپەڕەوە. لەم بابەتە یەک ڕاناو هەیە ئەویش ڕاناوی کەسی یەکەمی تاکە «م».
- سێیەم: ئەو ڕاناوانەی هەمیشە لە کۆتایی ڕابردووی تێنەپەڕەوە دێن، کە ئەمانەن:
  - ین - بۆ کەسی یەکەمی کۆ، وەک نوستین
  - یت، ی - بۆ کەسی دوەمی تاک. وەک: نوستیت (نوستی)
  - ن - بۆ کەسانی دوەم و سێیەمی کۆ وەک: نوستن.

تا ئێرە کارێکی کردبێتم، زیاد لەوەی نووسەرانی تر کردبێتیان، هەر ئەوەیە کە ڕاناوەکانم لە ڕووی هێزەوە کرد بە سێ پلە، بەڵام جارێ ئەنجامە هەرە گەورەکەی ئەم دیاردە ڕێزمانییە ماوە لە حەشارگە دەربهێنرێت.

من لە نموونااندا کاری ڕابردوو دەهێنمە نێو ڕستەکانەوە چونکە نامەوێ لێرەدا بە درێژی هەموو سەروبەرێک و ئەنجامێکی دوور و نزیکی ئەم دیاردەیە بکوتمەوە لەبەر زێدە درێژی و ئاڵۆزبڵۆزی باسەکە، ناوناوەیێکیش، بە نیازی پتر ڕوونکردنەوە، نموونە لە غەیری ڕابردووش دەهێنمەوە. هۆی بایەخدانیشم بە ڕابردووەوە لەوەوە دێت کە هەر خۆیەتی پلەی هێز و بێهێزیی کارەکانی تێدا بەدیار دەکەوێت چونکە دیتمان لە «ئایندە - مضارع»دا ڕاناوە چالاکەکان ناگۆڕێن لە تێپەڕەوە بۆ تێنەپەڕ.

ئێستا دێمە سەر ڕووناککردنەوەی دەروونی حەشارگەکە:

لە کاری ڕابردووی تێپەڕدا کە ڕاناوی چالاکی بەهێز و ناوەندی وەیا ناوەندی و بێهێز کۆبوونەوە هەمیشە ڕاناوە بەهێزترەکە دەبێتە کارا (فاعل) و بێهێزەکەش دەبێتە بەرکار (مفعول)، هەر چەندێکیش جێگەیان بە یەکتر بگۆڕیتەوە و ڕاناوە بەهێزەکە لە شوێنی بەرکار دانێیت و بێهێزەکەش بخەیتە شوێنی کاراوە هەمیسان ڕاناوە بەهێزەکە هەر بە کارایی (فاعلی) دەمێنیتەوە.

دەزانین لە ڕابردووی تێپەڕدا کارا (فاعل) بەرکار (مفعول) ـەکە دەخاتە پێشە خۆیەوە وەک دەڵێی:

- نانم خوارد
- گۆشتمان کڕی
- چیرۆکت نووسی

هەر بەو پێیەش کە ڕاناوی چالاک (واتە ڕاناوی لکاو) بەدوا یەکتردا دێن ڕاناوەکەی پێشەوە دەبێتە بەرکار و ئەوەی دواییش دەبێتە کارا، بەڵام کە ڕاناوەکان لە دوو پلەی جوداوازی هێزدا بوون هەمیشە هێزدارەکە دەبێتە کارا:

- دیتمن - واتە من ئێوە وەیا ئەوانم دیت
- دیتنم - هەمیسان بە واتای من ئێوە وەیا ئەوانم دیت (لەهجەی پژدەر).

لەم نموونەیەدا ڕاناوی «م» لە پلەی ناوەندی هێزدایە، ڕاناوی «ن» یش لە پلەی بێهێزی تەواودایە بۆیە هەر «م»ـەکە دەبێتە فاعل. بەڵام کە ڕاناوی «م» لەگەڵ ڕاناوی «ت»ی کەسی دووەمی تاکدا هات هەمیشە ڕاناوەکەی «ت» دەبێتە فاعل:

- دیتمت - واتە تۆ منت دیت.
- دیتتم - هەمیسان بە واتای تۆ منت دیت.

کە ویستت بڵێیت «من تۆم دیت» دەبێ ڕاناوە بێهێزەکەی کەسی دووەمی تاک بهێنیت کە «یت، ی»ـە: «من دیتمیت» (وەیا دیتمی). لەم نموونەیەی «دیتمی» ڕاستییەکی گەورە خۆ بەدیار دەخات:

ئەگەر لە گوتەی «دیتمی» مەبەست کەسی دووەمی تاک بوو و «ی»کە کورتکرایەوەی «یت» بوو ڕاناوی «م» فاعلە و «ی»ـەکە مفعولە. بەڵام ئەگەر لەگوتەی «دیتمی»دا ڕاناوەکەی «ی» بۆ کەسی سێیەمی تاک بوو ئەوسا ئەو دەبێتە فاعل و ڕاناوەکەی «م» دەبێتە مفعول چونکە ڕاناوی «ی» بۆ کەسی سێیەمی تاک بەهێزترە لە ڕاناوی «م» جێگاکەشی جێگەی فاعلە چونکە کەوتۆتە دواوەی ڕاناوەکەی تر. کەواتە لە ڕستەی «دیتمی» دا ئەگەر مەبەست «دیتمیت» بوو ڕاناوی «م» فاعلە و «ی - یت» مفعولە، بە پێچەوانەی ئەوەی ڕاناوەکەی «ی» بۆ کەسی سێیەمی تاک بێت کە ئەوسا «م»ـەکە دەبێتە مفعول و «ی»ـەکەش فاعل.

لەم دەستوورەوە دەزانرێ ئەگەر دوو ڕاناوی بەهێز لە کاری ڕابردووی تێپەڕدا کۆبوونەوە ڕاناوەکەی پێشەوە دەبێتە مفعول و هی دواوەش دەبێتە فاعل بەپێی دەستووری گشتی ڕێزمان وەک کە لە هەندێ شێوە ئاخاوتندا دەڵێن «دیتمانیان - واتە ئەوان ئێمەیان دیت». بەڵام ڕاستتر ئەوەیە لەتەک ڕاناوی بەهێزدا کە ببێتە فاعل ڕاناوی بێهێز بەکار بێت وەک مفعول. باشتر و دروستتر ئەوەیە بگوترێ «دیتیانین - بە واتای ئەوان ئێمەیان دیت» کە بە پێی دەستوور ڕاناوی بێهێزی «ین» بۆ کەسی یەکەمی کۆ وەک مفعول هاتۆتەوە.

ئێمە کە ڕاناوی «م» لە پێش و لە پاشی ڕاناوی فاعل بەکار دێنین و دەڵێین «دیتمان، دیتیانم» لە هەردوو حاڵیشدا «م»ـەکە مفعولە بۆیەیە چونکە ڕاناوی «م» لە پلەی ناوەندی هێزدایە و بە فاعلی و بە مفعولی هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام ڕاناوە بەهێزەکان شێوەی بێهێزیان هەیە کە ببێتە مفعول کەواتە چاکتر ئەوەیە لە حاڵی مفعولیدا شێوە بێهێزەکەیان بەکار بێت.

له ئاینده (مضارع)دا دەستوورێکی گشتی هەیە کە بریتییە لەوەی ڕاناوی لکاوی دوای نیشانەی ئاینده کە دەنگی «دە»یە [لە شێوەی سلێمانی دەنگی «ئە»یە] هەمیشە دەبێتە مفعول لەبەر ئەمە کە دەڵێی «دەتان بینم» ڕاناوی «تان» مفعولە و ڕاناوی «م» فاعلە، هەروەهاش کە دەڵێی «دەتان بینین، دەیان بینین» لە هەموو حاڵدا ڕاناوەکەی دوای «دە»ی ئاینده مفعولە.

لێرەدا دیمەنێکی بەڕواڵەت سەیر دێتە پێش چاو: ڕاناوە بەهێزەکان بوونەتە مفعول و بێهێزەکانیش فاعل. هۆی ئەم دیاردەیە لەوەوە دێت کە ڕاناوی لکاوی فعلی «ئاینده - مضارع» هەمیشە بێهێزە هەرچەند فاعلیشە، واتا لە گوتەی «دەبینین»دا ڕاناوی «ین» فاعلە و دەبێ فاعل بێت ئیتر بەناچاری ڕاناوی بەهێزی کەسەکان وەک مفعول دێتەوە لە مضارعدا چونکە مومکین نییە (وەیاخود پەسەند نییە) لە مضارعدا ڕاناوی بێهێز بە غەیری فاعلیەت بێت.

ئەم تێبینییەی هاتنی ڕاناوی بێهێزەکانیش بۆ کاری ئاینده و هی بەهێز بۆ ڕابردووی تێپەڕ جارێکی تریش لە سرنج گرتن لە صیغەی ڕابردووی بەردەوام تێدەخوێندرێتەوە:

وەک دەزانین صیغەی «ڕابردووی بەردەوام - ماضي استمراري» نیشانەی ئایندەی لە پێشەوە دێت وەک کە دەڵێین «دەمان دیت، دەی خوارد، دەتان بیست» - (لێرەدا کاری تێنەپەڕمان پێوست نییە چونکە دەمانەوێ بزانین کارا و بەرکار و چۆن ڕەفتار دەکەن، دیاریشە لە کاری تێنەپەڕ بەرکار پەیدا نابێ).

گوتمان لە کاری ئایندەدا هەمیشە مفعول دەکەوێتە دوای نیشانەی «دە»ی ئایندەوە، وەک «دەمگرن، دەمبینن..» بەڵام لە ڕابردووی بەردەوامدا چونکە کارەکە ئاینده نییە و ڕابردوە، نیشانەکەی «دە» سروشتی خۆی دۆڕاندوە و لەوە دەرچوە نیشانەی ئاینده بێ، بۆیەیە ئەو ڕاناوەی بەدوا «دە»کە دادێت ڕاناوی فاعلیە نەک مفعول ڕاناوەکەی مفعولیش کە دەکەوێتە دوایی فعلەکەوە ڕاناوی بێهێزی مفعولە وەک کە لە ڕابردووی عادەتی دەڵێی: «هەڵیان گرتم، ڕایان گرتم». ئەم ڕاستییەیە مەتەڵەکەی:

- دەمگرن (ئاینده - مضارع)
- دەمگرتن (ڕابردووی بەردەوام)

ڕوون دەکاتەوە: وەک دەبینیت، دۆزینەوەی ئەم دیاردەیەی بەهێزی و بێهێزیی ڕاناوی چالاک (لکاو) ڕووپەڕەیێکی هەڵنەدرایەوەی ڕێزمانی کوردی هەڵدەداتەوە کە لەوێدا نهێنی و نەزانراویی هۆی بەشێک لە ڕەفتارە سەیرەکانی ڕاناوی لکاو دێتە ناو جغزی ئاشکرایی و زانراوییەوە.

هەڵدانەوەی ڕووپەڕەی ئەوتۆیی لە تاکە ڕێی لێکۆڵینەوەی ڕەسەن و سەربەخۆی زمانەکەمانەوە مومکین دەبێت، هەرگیز بە ڕووناکایی خواستنەوە دەستووراتی ڕێزمانە بێگانەکان حەشارگەی هێندە خۆماڵی ڕۆشن نابێتەوە.

2- حەشارگەی پاشگرەکانی «کار»

لە نێوان ڕێزمانشناسەکانی کورددا وا ڕۆییشتوە کەوا تەنها دوو پاشگری کار هەیە لە زمانی کوردی ئەویش پاشگرەکانی 1- «اندن» 2- «ەوە» (یاخود «وە» بەلای هەندێ کەسەوە) وەک دەڵێی «برژاندی، برژایەوە، برژاندییەوە...». بێگومان ئەم دوو پاشگرە پاشگری هەرە بەرچاوی زمانی کوردین. وا دەزانم زێدە بەرچاوبوونی ئەوان وای کردوە پاشگری تری نابەرچاو (ئەگەر هەبن) لە زمانی کوردیدا بەجارێک بزربوون و چوونەتە حەشارگەی نابەرچاوییەوە.

پاشگری تر غەیری ئەم دووانە، نەختێک بە خۆ ماندووکردن و وردبوونەوە و لێدانەوە دەردەکەون. من لە سەرنج ڕاگرتنی خۆمدا سێ پاشگری تری بێگومان و یەکێکی گوماناویم دۆزیوەتەوە. دوور نابینم هی تریش هەبن. لە سێ پاشگرە بێ گومانەکان یەکێکیان وەختە بچێتە ناو چاوانەوە کەچی ناشدیترێ وەیاخود بابڵێم تا ئێستا هەستی پێ نەکراوە وەک پاشگر.

بەڕاستی نەدیتنی ئەو پاشگرە لە لایەن ڕێزمانشناسانی کوردەوە چ تەعلیلێکی دڵخۆشکەرەوەی نییە، هیچ کامێکیش لەو ڕێزمانشناسانە بایی سەری دەرزی عوزری نەدیتنی پاشگرەکەیان بە دەستەوە نییە مەگەر عوزری نەبوونی ناوونیشان و سەروسوراغێکی لە ڕێزمانی بێگانەدا، بەتایبەتی ڕێزمانی فارسی کە لەوێدا باس و خواسی «اندن» هەیە لە تەک «انیدن»دا. دیارە دیتنی پاشگری «ەوە» پێویستی بەوە نییە لە زمانی تردا نموونەی هەبێ چونکە بۆخۆی لە کوردی هەندە زەق و بەرچاوە لە وانە نییە نەدیترێت،

لە پێشەوە باسی ئەم پاشگرەیان دەکەم، ئەویش «ا»یە لە کاری وەک «ترسا، سووتا، نووسا، برژا...»دا کە صیغەی ڕەسەنی ڕوودانن. ئەم پاشگرە لە ژێر سێبەری «اندن»دا بە تەواوی نادیار بوە و نیگای کەسی بۆ نەچوە کە حیسابێکی پاشگربوونی بۆ بکات. لەگەڵ ئەمەشدا هەر لە ڕێی بەکارهێنانی «اندن» ـەوە پاشگربوونی «ا»بە ئیسپات دەگات.

وشەیێکی وەک «ترس» بە هۆی «اندن» ـەوە دەکرێتە «ترساندن» و فعلەکەش دەبێتە فعلێکی پاشگردار. لەمەدا چ ئیعتیراز نییە چونکە ڕاستییەکی بێ دەمەتەقەیە، بەڵام دەبوو بەبیرماندا بێتەوە وشەی «ترس» بەر لەوەی بە هۆی «اندن» ببێتە «ترساندن»، بە هۆی «ا» بۆتە «ترسا».

لێرەدا ڕەنگە ئیعتیرازێک بگیرێت و بگوترێت ئەم دەنگەی «ا» لە کۆتایی کارەکەدا بەشێکی ئەسڵی کارەکەیە وەیاخود شێوەیێکی تصریفییە نەک پاشگر، بەڵام نەختێک بەراوەردکردنی کارەکە لەگەڵ هی تری وەک ئەودا کە بە ڕواڵەت «ا» یان لە کۆتاییدا هەیە پێمان دەسەلمێنێ ئەم «ا»یە پاشگرە نەک شێوەی تصریف وەیا پیتی ئەسڵی وشەیە:

هەموو ئەو فعلانەی غەیری «ڕوودان – مطاوعة» کە دەنگی «ا» لە کۆتاییاندا هەیە کاتێک کە دەخرێتە گەردانی داهاتووەوە دەنگەکەی «ا»یان تێدەچێت و نامێنێت، لەمەشدا فعلەکە تێپەڕ بێت وەیا تێنەپەڕ فەرقێک ناکات بە نموونە:

- کێڵام – دەکێڵم
- هێنام – دەهێنم
- ڕاوەستام – ڕادەوەستم
- وێرام – دەوێرم

بەڵام لە فعلی «ترسام - سووتام»دا دەنگەکەی «ا» لە ئایندەدا بەدیار دەکەویتەوە لە شکڵی «ێ»:

- ترسام - دەترسێم
- سووتام - دەسووتێم

ئەمەش بەتەواوی وەک گۆڕانی ئەلفەکەی «اندن»ـە بۆ «ێ»:

- ترساندم - دەترسێنم
- سووتاندم - دەسووتێنم

ڕەسەنبوونی ئەم دەنگەی «ا» لە کاری وەک «ترسام، ترازام...»دا لە گەلێک ڕووی ترەوە بە ئیسپات دەگات یەک لەو ڕووانە ئەوەیە کە دەبینین لە حاڵی پێکهێنانی «اسم فاعل مرکب» لە کاری تێنەپەڕدا هەمیشە ئەم «ا» یە بەدیار دەکەوێت وەک بەشێکی بنجی وشە:

- خێراسووتاو - ناگوترێ: خێراسووت
- هەمیشەترساو - ناگوترێ: هەمیشەترس

لە حاڵێکدا کە کاری تێنەپەڕی عادەتی بکرێتە «اسم فاعل مرکب» سوانی بەسەردا دێت وەک:

- بەرهەڵست - نەت گوت: بەرهەڵستاو
- تیژڕۆ - نەت گوت: تیژ ڕۆیشتوو
- هەڵکەوت - کە بڵێی «هەڵکەوتوو» صیغەکە هی اسم فاعلی عادەتییە وەک تێر نوستوو، زۆر ڕۆییشتوو....
- تێپەڕ - نەت گوت: تێپەڕیو کە اسم فاعلی عادەتییە.

چەند ئاشکرایە کە هەبوونی یەک صیغەی «اسم فاعل مرکب» لە فعلی وەک «سووتا، برژا»دا بەڵگەی بنجیبوونی دەنگەکەی « ا»ی کۆتایی فعلەکانە وەک پاشگر، کە لادانی مومکین نییە.

ئەم تێبینییەی دروستبوونی «اسم فاعل مرکب» پتر بنجیبوونی «ا» کەی «سووتان، برژان... هتد» دەردەخات کە بێین «اسم فاعل مرکب»ی فعلێک سەیر کەین کە «اندن»ی تێدا بێت وەک:

- دەماربزوێن
- شەڕهەڵگیرسێن
- ئاوکوڵێن

دەبینین لەم نموونانەشدا ئەلفەکەی «اندن» لە صیغەی مضارعدا بوە بە «یٚ» و تێکەڵ بە پێکهێنانی اسم فاعلەکە بوە، واتە چونکە ئەلفەکە بنجییە لە فعلەکەدا هەر ماوەتەوە و تێنەچوە.

تەنها فەرقێک هەبێ لە نێوان قابلیەتی «سووتان و سووتاندن» هەر ئەوەیە کەوا «سووتاندن» صیغەیێکی تریشی هەیە بوو پێکهێنانی «اسم فاعل مرکب» ئەویش لە ڕابردووی فعلەکەوە وەردەگیرێت وەک:

- دار سووتاندوو
- گۆشت برژاندوو
- دیوار ڕماندوو

ئەم صیغە زیادەی «سووتاندن» لەچاو «سووتان» لەوەوە دێت کە هەموو فعلێکی تێپەڕ دوو صیغەی «اسم فاعل مرکب»ی هەیە نەک تەنیا ئەو فعلانەی «اندن» یان بە دوادا هاتوە وەک:

- گۆشتخۆر، گۆشت خواردوو - گۆشت برژێن، گۆشت برژاندوو
- ئاردپێو، ئارد پێواو - ئارد ڕژێن - ئارد ڕژاندوو
- جلشۆر، جل شوشتوو - جل دڕێن، جل دڕاندوو

ئەم بەردەوامبوون و مانەوەی ئەلفەکەی صیغەی ڕوودان هەر وەک ئیسپاتی ئەوە دەکات کە ئەلفەکە پاشگر و پێکهێنەری فعلەکەیە، لە هەمان کاتدا هەر خۆیەتی دەبێتە هۆی گومانکردن لەو پاشگرەی کە زووتر گوتم پاشگرێکی گوماناوییە چونکە پاشگرە گوماناوییە کە لە صیغەی ئایندەدا بەدەر ناکەوێتەوە، ئەمەش نموونەی ڕوونکردنەوە:

لە وشەی «تەقە» بە هۆی پاشگری «اندن»ـەوە فعلی «تەقاندن» پەیدا دەبێ. لێرەشدا بەرلەوەی بگەینە «تەقاندی» فعلێکی تری تێنەپەڕ هەیە ئەویش فعلی «تەقی»یە... ئەم فعلە «تەقی»ش بە هۆی دەنگی «ی» پەیدا بوە، کەواتە ڕێی تێ دەچێ خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوات کەوا فعلی «تەقی» یش وەک «ترس، ترسا» بە هۆی پاشگرەوە پەیدا بووبێ پاشگرەکەش «یٚ»بێ. لەیەکچوونی «ترسا - تەقی» جارێکی تریش بەهێز دەبێت بەوەدا کە هەردووکیان فعلی «ڕوودان - مطاوعە»ن، هەموو فعلەکانی تری وەک «ڕزی، خزی، جمی، وەری....» ئەوانیش لەبابەتی «تەقی»ن و فعلی ڕوودانن. ئەم لەیەکترچوونانە وادەکەن زیهن بۆ ئەوە بڕوات «ی» کەش وەک «ا» کە پاشگر بێت، بەڵام لە دوو لاوە ئەم ئیحتیمالە بێهێز دەبێت:

یەکەم: وشەی «ترس» کە دەبێتە «ترسا» بە هەمان ڕێگەدا دەڕوات کە «اندن»ی پێدا ڕۆییشتوە و دەبێتە «ترساندی» واتە ئەلفەکە و «اند»ەکە وەک ئاوی یەک سەرچاوەن، کەچی وشەی «تەقە» کە دەبێتە «تەقی» بە هەمان ڕێگەدا نابێتە «تەقیندی» تاکوو بڵێین لێرەدا پاشگری «ی، یند» هەردوویان وەک «ا- اند» لە یەک سەرچاوەوە هەڵقوڵیون چونکە فعلی «تەقی» دەبێتە «تەقاندنی»، ئەمەش هێند ئاشکرایە بەدواکەوتنی ناوێ.

دووەم: ئەم «ی»ـە لە ئایندەدا دەرناکەوێتەوە تاکوو بڵێین بەشێکی گرنگی فعلەکەیە و پاشگرە. «تەقە» کە لە ڕابردوودا بە «تەقی» لە ئایندەدا «ی»ـە کە تێ دەچێت، تێچوونەکەش لەگەڵ ڕاناوی کەسی یەکەمدا ڕوونترە وەک:

- تەقیم - دەتەقم

- خزیم - دەخزم

ئەگەر فعلەکە «تەقا، خزا» بوویایە لە ئایندەدا دەبوونە «دەتەقێم، دەخزێم».

لەم گوتارەدا بۆ دەرخستنی پاشگربوونی «ا» نموونەم لە «ترس» هێنایەوە کە «اسم مصدر»ە و بنگەی لێکدانەوە بە چاکی ڕوون دەکاتەوە چونکە سەرچاوەیێکە هەردوو فعلی «ترسا، ترساندی» لێ هەڵکوڵیوە. وشەی تری «اسم مصدر» زۆرن وەک «ترس» کە لەوانیش فعل بە هۆی «ا - اند» وەرگیراوە، بە نموونە:

- جۆش - جۆشا، جۆشاندی
- خرۆش - خرۆشا، خرۆشاندی
- گریە - گریا، گریاندی
- سوورِ - سوورِا، سوورِاندی
- خول - خولایەوە، خولاندییەوە
- نووزە - نووزایەوە نووزاندییەوە
- جووڵە - جووڵا، جووڵاندی [جووڵایەوە، جووڵاندییەوە]

لە فەرهەنگی کوردیدا وشەی تر زۆرن لەم بابەتەی «اسم مصدر - ناوی چاووگ» کە دەبنە بنگەی فعلی ڕوودان بە هۆی پاشگری «ا» و فعلی تێپەرِ بە هۆی «اند»، بەڵام لە زماندا هەموو جاران دروستکردنی ئەم تەرزە فعلانە پەکی لەسەر ناوی چاووگ نەکەوتوە چونکە لە سەرچاوەی ترەوە کار دروست دەکەن وەک لە وشەی «ترش» کە ئاوەڵناوە فعلی «ترشا، ترشاندی» دروست دەبێت، زۆر جارانیش فعلەکان لە بەشی وشەیێک پێکدێن کە دەبنەوە بنگەی «ناوی کارای لێکدراو» (اسم فاعل مرکب) وەیا «ناوی ئەمراز» (اسم آلة) وەیا ناوی تری جۆرجۆر وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

- ڕما - ڕماندی
- سووتا - سووتاندی
- برژا - برژاندی
- درِا - درِاندی - درِی
- سرِایەوە - سرِییەوە
- ڕفا - ڕفاندی [بۆتە فرِاندی]
- ستنا - ستاندی
- چنا - چاندی

ئەم کارانە لە اسم مصدرەوە نەهاتوون:

- کاری «ڕما - ڕماندی» چ بنگەیێکی وەهای نییە بڵێین لێیەوە وەرگیراوە، مەگەر ئەو بنگەیە کە دەنگی «ڕمان»ی شت لەگەڵ دەنگەکەی «ڕم» لە یەکتر دەچن وەک کە «گرمە» خۆی بنگەی «گرماندی»یە.
- وشەی «سووتا - سووتاندی» بنگەی «سووت»ی تێدایە کە لە «چەنگ سووتەکە، سووتوو...»دا دەردەکەوێتەوە.
- «برژا، برژاندی» لەگەڵ «خاوبرژ، برژەبرژ....»دا هاوبەشی بنگەی «برژ»ن.
- «دڕا، دڕاندی، دڕی» ڕادەگیرێن لەگەڵ «ماسیدڕ، سەردڕ...».
- وشەی «سڕایەوە - سڕییەوە» (لێرەدا «سڕاندییەوە» پەیدا نییە: دەشێ بگوترێ وشەکە صیغەی «بناء للمجهول»ـە و لە بنەڕەتدا «سڕرایەوە» بوە و لێی سواوە) لەگەڵ «دەستەسڕ» بەراورد دەکرێن.
- وشەی «ڕفا» بنگەیێکی مەعلومی نییە ئەوە نەبێ کە لە فارسیدا «ربودن» هەیە بەڵام لەوێدا هەر بەتێپەڕی بەکار دێت کە دەوەستێتە بەرانبەر «ڕفاندن - نەک ڕفا».

دوو فعلی «ستنا، چنا» ڕوونکردنەوەیێکیان دەوێت، بۆیە هەر لە لیستەکەدا خرانە یەک کەوانەوە:

لە لاپەڕە 234ی بەشی یەکەمی بەرگی سێیەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، لە گوتاری «پاشگری ((اندن)) لە زمانی کوردیدا»، نووسینی د. نەسرین فەخری فعلی «چناندن» باسی هاتوە و بە پەراوێز لە خوارووی لاپەڕەکەوە نووسراوە «ئەمەم لە مامۆستا مەسعود بیستوە». چی من بۆ د. نەسرینم ڕوون کردۆتەوە ئەوەیە لێرەدا دەینووسم هەم لەبارەی «چناندن» و هەم لەبارەی «ستناندن»ـەوە:

من گوتوومە، لە گوتارێکیشمدا بڵاوم کردۆتەوە دوو فعلی «ستاندی، چاندی» کەوا هەموو ئەو زمانشناسانەی من لێیان شارەزام وا دەزانن تەنها صیغەی تێپەڕیان هەیە، لە واقیعدا هەردووکیان فعلە تێنەپەڕەکەیان هەیە و تا ئێستاش لە نێوان بەشێکی زۆری عەشیرەتەکانی کورد بەکار دێن. دوو فعلی «ستنا، چنا» هێندەی هەموو فعلێکی تر لە گەڕدایە لە جێگەیێکی وەک پژدەر و هۆزەکانی سەر بە بلباسەتیدا خەلق بە ڕاشکاوی دەڵێن:

- ئەم قەرزە بە کەس ناستنێ - قەرزەکە ستنا
- ئەرزەکەم دوێنێ چنا - تا دوو ڕۆژی دیکە دەچنێ

دیارە کە فعلەکە «ستنا و چنا» بێ، دەبوو تێپەڕەکەیان «ستناندی و چناندی» بێت: بەلای منەوە لە تێپەڕدا یەکێک لە دوو نوونەکان سواوە.. لێرەدا پێویستە بڵێم فعلی «دەچنێ» کە لە «چنا»وە وەرگیراوە بەڕێکەوت لە کەسی سێیەمی تاکدا لەگەڵ «دەچنێ»ی فعلی «چنین» یەکتر دەگرنەوە، کە ئەمە ڕواڵەتێکی بێبایەخە، بەڵگەش لەمەدا ئەوەیە کە فعلەکان بدرێنە پاڵ کەسانی ترەوە لە یەکتر دەترازێن وەک:

- دەچنێم، دەچنێین، دەچنێن، دەچنێیت
- دەچنم، دەچنین، دەچنن، دەچنیت

پوختەی گوتە ئەوەیە پاشگری «ا» وەک پاشگری «اند» بەدوا ناوی چاوگ و وشەی تردا دێت با ئەو وشانەش ڕاستە واتاییێکی ئاشکرایان نەبێ، خۆ ئەگەر یەکێک بڵێ لە فعلی وەک «ڕما»دا کە ئەسڵەکی مەفهوومی نییە

بەڵگە پەیدا دەبێ کە «ا» کەی کۆتایی فعلەکە بەشێکی فعلەکە بێت نەک پاشگر، ئەوسا دەبێ دان بەوەدا بێنین کە پاشگری «اند» یش بەشێکی فعلەکەیە و پاشگر نییە چونکە هەردووکیان لەیەک بار و یەک هەڵوەستدان و دەچنە ژێر حوکمی یەک دەستوورەوە. جوداوازییێکی گرنگ و بەرچاو هەبێ لە نێوان دوو پاشگری «ا، اند»دا ئەوەیە کە پاشگری «اند» بەهێزترە و پێی دەکرێ پتر لە «ا» فعلان پێکبێنێت، کە ئەمە ڕاستیەکە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی پاشگرەکانی و پلەی هێزیان و چ دەخلێکی نییە بەسەر پاشگربوون و نەبوونیانەوە. بە نموونەی ڕوونکردنەوە دەڵێم ئەو «ی»ـەی کە ناوی واتا دروست دەکات «وەک: جوان، جوانی - خۆش، خۆشی... » چی لێکەم نابێتەوە بەوەدا کە پێی ناکرێ هەموو جاران لە هەموو وشەیێکدا ببێتە هۆی دروستبوونی ناوی واتا. وشەی «کورد» دەبێتە «کوردایەتی» بە پێی دەستووری دروستکردنی ناوی واتا لە ناوی هۆز و میللەت و شتی ئەوتۆوە، لەمەشدا خەلەل بە دەوری «ی» ناگات لە مەیدانی خۆیدا. وشەی «خایاندنی»ش هیچ بنگەییێکی واتاداری نییە لێیەوە پەیدا بووبێت، تەنانەت فعلی «خایا»ش دروست نەبوە تا بڵێین لەوەوە سەری هەڵداوە.

پاشگری دوەم کە ئەویش زۆر خزمی پاشگری «ا»یە و بەر هەمان دەستووراتی تصریف دەکەوێت پاشگری «کا» یە. لە پێشەوە دەبێ بڵێم دەنگی «ک» لە وشەسازیی کوردیدا دەورێکی گەورە دەبینێت چ بە تەنها بێتە ناو تەکوینی وشەوە چ لەگەڵ دەنگی تردا. نموونەی دەوری «ک» لە وشەی غەیری فعلدا لەم لیستەیەی ژێردا دەردەکەوێ:

- جل - جلک
- دار - دارک [دارکە تووتن]
- شل - شلک، شلکێنە
- سەر - سەرەک، سەرۆک
- بن - بنک
- بەیان - بەیانەکی
- لا - لاوەکی

تۆژینەوەی سەرلەبەر لە باسی دەوری «ک» لە وشەسازیی کوردی زۆری بەبەرەوەیە، من لەم نووسینەدا بەسەر نموونەکاندا تێ دەپەڕم بەو نیازەی نیگاییێکی خێرای خوێنەر بۆ فرەوانی و هەمەچەشنەیی و زۆری ئەو وشانە ڕابکێشم کە دەنگی «ک» لە دەرەوە بۆیان دێت و تێکەڵ بە دروستبوونیان دەبێت. دیارە هەمان قابلیەتی زێدە بەرچاوی دەنگی «ک» لە پێکهێنانی وشەی «ناو، ئاوەڵناو، ناوی ئالەت...» هەر خۆیەتی دەردەکەوێتەوە لە هاتنی بە شێوەی پاشگر لە کۆتایی هەندێک فعلی کوردیدا.

ئەم پاشگرەی «کا»ش وەک دوو پاشگری «ا، اند» وا دەبێ بەدوا وشەی واتاداردا دێت و دەیکات بە فعل، واش دەبێ بەدوا وشەیێکدا دێت کە لەو ڕواڵەتەدا واتای دیاری نییە وەک لەم نموونانە دەردەکەوێ:

- ئاڵۆز - ئاڵۆزا - ئاڵۆزکا
- نووزە - نووزایەوە - نووسکایەوە
- مردن - دامرد - دامرکایەوە
- تۆتەگرتن - هەڵتۆتەکا

لەم نموونانەدا بنەمای واتادار هەبوو، ئەوانەی خوارەوەش لەوانەن فۆرمی ئێستاکەیان واتای سەربەخۆی تێدا نییە:

- بزڕ - بزڕکا
- ترووش - هەڵترووشکا
- خلیس - خلیسکا [خلیسک بە هۆی «ک» بووەتە ئاوەڵناو]
- پەشۆ - پەشۆکا [ڕەنگە لە «پەشێو»ـەوە هاتبێ، بەو پێیە دەبێ «پەشێوکا» بووبێت و لێی سوابێت. ئەگەر وابێ دەبێ نموونەکە بخرێتە لیستەی ژوورا]
- پروو - هەڵپرووکا [ڕەنگە لە «پروان - هەڵپروان»ـەوە هاتبێ، بەڵام ناتوانم بەتەواوی لێی دڵنیا بم]

ئەم نموونانە بەسن بۆ ئەو مەبەستەی من لێرەدا دەوری هەڵدێم، کەسێک بیەوێ دەتوانێ نموونەی تر لە زمانی کوردی بدۆزێتەوە.

پاشگری «کا» وەک دوو پاشگری «ا- اند» لە ڕێژەی ئایندەدا دەنگەکەی «ا»ی دەبێتە «ێ» و دەگوترێ:

- دەئاڵۆزکێ - دەنووسکێتەوە - هەڵدەتووتەکێ - دادەمرکێ دەبزڕکێ... هتاد

بەمەشدا جارێکی تر دەردەکەوێ کە وا سەرلەبەری «کا» پاشگرە و بۆتە بەشێکی بنجیی فعلەکان و لە گەرداندا هیچ یەکێک لە دوو دەنگەکانی تێ ناچن.

لە بارەی ئەم پاشگرەوە چەند تێبینیەک هەیە:

- یەکەم: لە سروشتی پاشگرەکەدا «وصفية» هەیە بۆیەیە ئەو فعلانەی دروستیان دەکا شێوە و وێنە و چۆنایەتییان تێدا دەردەکەوێ. ئەم ڕاستییە وا دەکا جوداوازی بکەوێتە نێوان ئەو فعلەی بە «ا» پەیدا دەبێت و ئەوەی بە «کا» پەیدا دەبێت: فعلی ئەلفی [واتە بە هۆی «ا» پەیدا دەبێ] هەر لەو حاڵەدا وەسف ڕادەگەیەنێ کە ئەسڵی ماددەکە لە بنەڕەتدا وەسفی تێدا بێت وەک: گەشایەوە، شێوا، ئاڵۆزا... بەڵام لە فعلی وەک ڕما، پسا، کوڵا...دا هیچ وەسف دەرناکەوێت و هەموویان ڕوودانی سادەیان تێدایە. فعلی «ترسا» وەسفێکی تێدایە لەوەوە دێت کە «ترس» خۆی لە کەسی ترساودا دەر دەکەوێت وەک کە «جۆش» لە ئاوی جۆشاودا دیاردەییێکی ئاشکرایە ئیتر فعلی «جۆشا»ش وێنەی تێدا پەیدا دەبێ.
- دووەم خزمایەتییەکەی «کا» لەگەڵ «ا- اند» دا وای کردوە بەشێکی فعلەکانی قبووڵی «ا- اند» بکەن وەک ئاڵۆزکا - ئاڵۆزا - ئاڵۆزکاندی.
- سێیەم: سەربەخۆیی «کا» وای لێدەکا هەموو جاران جۆت نەیەت لەگەڵ «ا-اند»دا: هەڵتووتەکا و هەڵترووشکا قبووڵ ناکەن بە «اند» تێپەڕ بکرێن وەیا بە هۆی «ا» فعلیان لێ پەیدا بێت.

لێرە بە پێشەوە لە موناسەبەدا گوتوومە من وا پەسەند دەکەم ئەم پاشگرەی «کا» بەکار بێت لە داهێنانی ئەو فعلانەی وەسفیان تێدایە وەیا حاڵەتی شت دەگۆڕن. بە نموونە لە موناقەشەدا دەرم بڕیوە ئەگەر لە وشەی «هەڵم» فعل دروست بکرێ دەبێ بڵێین «هەڵمکا» نەک «هەڵما، هەڵمی» چونکە گۆڕانی شکڵی ئاوی تێدایە. تۆ سەیری کە دەست، بەدوا ڕێخشان وەیا سووتاندا، پێستەکەی هەڵدەستێ دەگوترێ «پفکەی کردوە - نەک

پەی کردوە» کەچی وشەیێکی وەک «ئاوس» کە خۆی وەسفە دەشێ بە هۆی «ا» ببێتە فعل «ئاوسا» چونکە لە بنەڕەتدا وەسفیەتی تێدایە.

پاشگری سێیەم چاوی هەموو زمانشناسێک لە ڕێزمانی کوردی بەسەریدا خشاوە، نالێم دیتوویەتی، بەزۆریش باسی کراوە بەڵام بێ ئەوەی هەست بە ئەوە بکرێ کە پاشگرە. وا دەزانم هۆی ئەم هەست نەکردنەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییە کە وا لە ڕێزمانەکانی غەیری کوردی پاشگرێک نییە بوەستێتە بەرانبەر ئەم پاشگرە، لەبەر ئەمە مومکین نەبوە لە ڕێی شوێنپێ هەڵگرتنەوەی زمانشناسانی بێگانە کەس تێی هەڵئەنگوێت. هەموو دۆزینەوەیێکی تازە و بە درەنگەکاتەوە لە ڕێزمانی کوردی ئەوەمان بۆ ئیسپات دەکات کە وا بە عادەت تێفکرینی ڕێزمانیمان لە سەرچاوەی فکر و تۆژینەوەی ڕێزمانی غەیری کوردییەوە هەڵقوڵیوە. ئەم لاساییکردنەوەمان بوو بە هۆی ئەوەی باسە ڕێزمانیەکانمان بکەونە ژێر هەمان سەرەباسی کە لە زمانەکانی بێگانەدا بوونەتە سەرەباسی ڕێزمان تا گەیشتینە حاڵێک بڵێین دەبێ «فعل الکینونة» لە ڕستەی وەک «من ئازام»دا هەبێت.

ئێمە «فعل الکینونة»ی ئینگلیزی و فرەنسەیی و ڕووسی لەو ڕستە کوردییانەدا خەلق دەکەین کە بە وەهم و خەیاڵیش تێیاندا پەیدا نییە کەچی پاشگرێکی وەک «ا، کا» نابینین هەرچەند وەها زەق و ڕەقە خەریکە لە چاوان بچەقێت هەر چونکە ئەوەی وجودی نییە لە زمانەکەماندا لە زمانی تردا وجوودی هەیە، ئەوەی وجوودیشی هەیە، لەواندا نییە.

بە ڕاستی ئێمە ڕێزمان لە ڕێزمانی بێگانە هەڵدێنجین ناویشی دەنێین «ڕێزمانی کوردی». ڕەنگە زۆربەی هەرە زۆری زاراوەکانمان وەرگێڕانی پیت بە پیتی زاراوەی بێگانە بێت، وەک ئەوەی کە زاراوەی «ڕاناوی لکاو و نەلکاو» وشەی «ڕاناو»ی لە Pronoun -ی ڕۆژاوا و دوو وشەی «لکاو و نەلکاو»یشی لە «متصل ومنفصل»ی عەرەبی وەرگرتوە. بەلای باوەڕەی منەوە چاولێکەری نەبێ هەرگیز ڕەوا نییە زاراوەی «لکاو و نەلکاو» بۆ ئەو بەشە ڕاناوە بەکار بێت چونکە هەرچی خاسیەت و تایبەتی ڕاناوەکان هەیە لەو زاراوەیەدا دەشرێتەوە و هەموو دەورە چالاکەکەیان لە ئاخاوتنی کوردیدا بە کفنی ئەو زاراوە درۆزنە وەک مردووی لێ دێت بە جۆرێک دەبینین یەکێک لە زمانشناسانەی زاراوەکەیان پەسند کردوە کەموزۆر ئیشارەیان بۆ ناکات. بە نموونە دەڵێم تۆ کە گوتت «مرۆڤ گیانلەبەرێکە بەسەر دوو قاچانەوە ڕادەوەستێت» ڕێگە لە فکری خۆت دەبەستییەوە کە بیر لە هۆش و نەفس و غەیبپەرەستن و «الحاد» و ڕقهەڵگرتن و هونەرکاری و زانست و... هتادی مرۆڤ بکەیتەوە چونکە ئەم لایەنانە هیچیان دەخلێکیان نییە بەسەر دوو قاچ و سێ قاچەوە. سەیریش ئەو سەیرەیە، کەس نییە نەڵێ پێویستە لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ لە زمانی کوردی بکرێ، کەچی لە کاتی دانانی دەستوورەکانی ڕێزمانی کوردی یەکسەر ڕێبازی حازربەدەستی ڕێزمانانی تر دەگرینە بەر.

ئەم پاشگرەیان ئەداتە زۆر مەشوورە زۆر باسکراوەکەی فعلی «مبني للمجهول»ـە کە لە زاری کرمانجی خوارووودا دوو دەنگی «را» یە.

لێرەدا کە دەڵێم نووسەرانی کورد باسی ئەم پاشگرەیان کردوە بێ ئەوە هەست بەوە بکەن کە پاشگرە، دەبێ ئیشارەتێکی بەهێز بۆ ئەو ڕاستییە بکەم کە د. عەبدوڵڵا نەقشبەندی ئەندامی شەرەفی کۆڕی زانیاری کورد، لە گوتارەکەی بە ناونیشانی «پاشکۆی ((درا))» کە لە ژمارەی یەکەمی گۆڤاری کۆڕدا بڵاو کرایەوە [مەبەستی لە پاشکۆ «پاشگر»ە] هەروەها بەدەم ڕوونکردنەوەی ناو گوتارەکە لێمان معلوم دەبێ مەبەستیشی لە «درا» کۆتایی ئەو فعلانەیە کە لە ڕابردووی مجهولی فعلی خاوەن «اند» پەیدا دەبن، وەک:

- سووتاندی - سووتاندرا

لەگەڵ ئەمەشدا من ناوی «حەشارگە» لە سەر ئەم پاشگرەی «را» هەڵناگرم: وا دەزانم گەلێک هۆی بایەخدار هەیە وا دەکات گوتارە باس کراوەکە دانەنێم بە ئاشکراکەر و ڕوونکەرەوەی پاشگری «را». سەیرێکی گوتارەکە بکەیت دەبینی خاوەن گوتار خۆی حیسابێکی بۆ ئەوە نەکردوە کە نووسەرانی کورد ئەم «درا...»یەیان بە پاشگر حیساب نەکردوە، ئەمەش ڕاستیەکە ڕێمان پێدەدا ئێمەش وەک نووسەری گوتارەکە وا دانەنێین گوتارەکە لە ڕێبازی پاشگری کوردیدا پیادەڕێیەکی تازە و نوێ و کەس نەدیتووی کوتاوەتەوە. جگە لەمە زۆر تێبینی تر هەن لە نوقتە نەزەری ڕابەربوون و ڕابەرنەبوونی گوتارەکەوە، هەموویان وام لێ خۆش دەهێنن بە نووسینەکەی خۆم دەربارەی پاشگری «را» بڵێم ئاشکراکەری حەشارگەیێک، هەرچەند ئەم قسەیەشم بە هیچ جۆرێک لە نرخی گوتارەکەی د.عەبدوڵلا داناشکێنێت چونکە نرخی گوتار هەر لەوەدا نییە ئایا ڕابەرە یا ڕابەر نییە: ناوەڕۆک پایەی نووسین دەردەخات.

ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو تێبینیانەی تازە باسم کردن:

1- لە سەرەتای گوتارەکەدا، لە ژێر عنوانی «پێشەک» دەردەکەوێ سەرچاوەی بۆچوونەکەی خاوەن گوتار باسی پێشگر و پاشگر نییە چونکە وەک خۆی دەڵێ باسەکەی لەسەر ئەوە هەڵستاوە کە «لێژنەی زمان» پێشنیاری کردبوو ئەگەر لە صیغەی مجهولدا دوو دەنگی «ر» کۆبۆوە پیتێکی «د» بخرێتە نێوانیانەوە بۆ نەهێڵانی قورسایی لە دەربڕینی دوو دەنگی «ر»ی یەک لەدوایەکدا وەک «گۆڕرا - گۆڕدرا» «کرِرا کرِدرا» «برِرا- برِدرا»... لەم سەرەتایەوە بۆ ناو باسەکە دەڕوات بە شێوەیێکی مەیلەو [بەلای منەوە] لێڵ، لێڵیەکەش لەو گوتارەدا شتێکی چاوەڕوانکراوە چونکە هەڵگرتنەوەی پاشگری «دار» لەم ڕێکەوتی هاتنی دالێک لەلاوە بۆ بەینی دوو دەنگی «ر»، پەردە بەسەر مەنشەئی پاشگرەکەدا دەهێنێت و تاریکی دەکات لە حاڵێکدا دەزانین زۆر کەس لە نووسەران و بێژەرانی کورد ئەم دالە بەکار ناهێنن و دەڵێن «کرِرا، برِرا، گۆڕرا» جگە لەوەی کە وا گەلێک لە فعلە تێپەڕەکان چ دەنگێکی «ر» یان بە دوادا نایەت تاکو بیر لە هاتنی دال بکەینەوە بۆ ناو صیغەی «مبني للمجهول» یان، وەک «کوژرا، دیترا، بیسترا، هێشترا «هێڵرا»، گوترا... هتاد». لەبەر ئەمە حیسابکردنی «درا» وەک پاشگر، کەسایەتی پاشگرەکەی «را» زڕ دەکات چونکە هەر دەڵێی وەک ئەو وێنەیەی لێ بەسەر دێت کە دوو تارمایی دەداتەوە، کەچی ڕاستی باسەکە ئەوەیە کە هەر یەک تاکیان حەقیقییە ئەویش «را»یە.

2- دواتر کە لە بەندی 3 و 4 دێتە سەر باسی «کردووەی یەککار و بناغەی دووکار» لەگەڵ ئەو فعلانە خەریک دەبێ کە «اند» یان بەدواوەیەوە بەپێی درێژەیێک کە لێرەدا کارمان پێیەوە نییە، ئەوەندە نەبێ کە پاشکۆکەی «درا»ی ناو گوتارەکە، سەرلەنوێ دالی کۆتایی فعلەکانی «اند»ی بەگەڵ «را» خستوە و خۆی لێیان پێکهێناوە. بەلای سرنج گرتنەوە زۆر ئاشکرایە، لە فعلی وەک «سووتاندرا» دا تەنها «را» پاشگرە و دالەکە هی کۆتایی فعلەکەیە، واتە هی «اند»ە:

- سووتاندی - سووتاندرا
- برژاندی - برژاندار

ئەم دالە نەک هەر لە فعلی خاوەند «اند»، بگرە لە هەموو فعلێکی کۆتایی بە «د» هاتبێت لە صیغەی «مبني للمجهول»یدا دەردەکەوێتەوە وەک:

- سپاردی - سپاردرا
- بژاردی - بژاردرا
- هەڵی کەند - هەڵکەندرا
- بواردی - بواردرا
- کردی - کردرا (بەسوان دەبێتە «کرا»)
- بردی - بردرا (لە سلێمانی بۆتە «برا» هەر وەک فعلی «خسترا» بۆتە «خرا»)

ئەم ڕاستییەی هاتنی «د» لە کۆتایی فعلەوە، نەک لە تەکوینی پاشگرەوە، ڕوونتر دەبێتەوە کە سەیری نموونەی ئەوتۆ بکەین کۆتاییان بە «د» نایەت وەک:

- دیتی - دیترا
- گوتی - گوترا
- کوشتی - کوژرا
- لستیەوە - لسترایەوە

لەم نموونانەدا دەردەکەوێ پاشگری فعلی «مبني للمجهول» تەنها «را»یە نەک «درا».

د. عەبدوڵلا لە گوتارەکەیدا بەڵێنی داوە کە لە گوتارێکی تردا باسی پاشکۆی «را» بکات، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا و دوای تێپەڕینی سێ ساڵ بەسەر بەڵێنیەکەدا دەرفەتێکی وای بۆ ڕێک نەکەوت بە ئەنجامی بگەیەنێت، دەشزانم هۆیەکی یەکجار بنجی و پەکخەری ئەم وەخرانە نالەباری باری تەندروستیی مامۆستایە. ئەگەر لێمان معلوم بووبایە لە چ ڕێبازێکەوە بۆ پاشگری «را» دەڕوات باشترمان دەزانی لێڵی و ڕوونی ئەم «درا»یە لە چ پلەیەکدایە.

زۆر لایەنی تری گوتارەکە، بەلای ڕوانینی منەوە، گرفتی هەیە کە وا بێگومان لە پلەی لێڵی زیاد دەکات هەر نەبێ لەبەر چاوی مندا کە بینینم لەگەڵ بینینی ناو گوتارەکە جودایە، وەک ئەوەی کە بە پێی ڕوونکردنەوە و نموونەکانی گوتارەکە هەر لە ڕێی بەکارهێنانی «اند»ەوە فعلی «دووکار» پەیدا دەبێت کەچی زۆر فعل هەن لەگەڵ صیغەی «اند» صیغەیێکی تری تێپەڕیان هەیە و هەر دوو صیغەش یەک واتا بەدەستەوە دەدەن، وەک:

- گەڕا - گەڕاندی - گێڕای / کەوت - کەواندی - خستی
- چۆ - چواندی - بردی / قەڵشی- قەڵشاندی - قەڵاشتی
- ڕۆیی - ڕواندی - هەناردی / ڕژا - ڕژاندی - ڕشتی

فعلی وەهاش هەیە پاشگری «اند» بەخۆیەوە ناگرێت و صیغەی تایبەتی دەیکاتە تێپەڕ وەک:

- هات - هێنای - مایەوە - هێشتیەوە... هەتاد.

یەکێکی تریش لەو لایەنانەی کە من تێیدا نەیارم لەگەڵ بیروڕای گوتارەکە ئەوەیە کە لە لاپەڕە 118ی گۆڤارەکە، لە زیمنی نووسینی گوتارەکەدا، فعلی«دەناسرێنی» هاتوە. من وادەزانم ناشێ فعلی «مبني للمجهول»

سەرلەنوێ بە هۆی «اند» وەیا شتێکی تر بکرێتەوە «مبني للمعلوم» لە فعلی «ناسین» کە خۆی تێپەڕە ڕێژەی «ناساندن» پەیدا دەبێت و دەگوترێ «تۆ بەو دەناسێنم وەیاخود بە یەکترتان دەناسێنم» نەک «تۆ بەو دەناسرێنم» وەیاخود «بە یەکترتان دەناسرێنم».

لە لاپەڕە 121 یش فعلی «کراندن» هاتوە کە گۆیا لە «کردن»ـەوە وەرگیراوە: ئەوەی من لە زمان و ڕێزمانی کوردی دەربارەی فعلی ئەوتۆوە بیزانم ئەوەیە کە وا کوردەواری دەڵێ:

- جلکەکانم بەکردن دا نەک جلکەکانم کراند
- گیسکەکەم بەخواردن دا نەک گیسکەکەم خوراند
- پشیلەکەم بە کوشتن دا نەک پشیلەکەم کوشتاند وەیا کوژراند

لە لاپەڕە 123ش گوتارەکە بۆ ئەوە چوە کە واتای «دڕێن» ئەوەیە کەمێکی وەیا لایێکی چشت دڕابێت و «دڕاندن»یش لەتلەتکردنی چشتەکە بێت وا دەزانم فعلی «دڕین» جگە لە «دڕاندن»ی شتی پان، واتاییکی تری هەیە کە لە «دڕاندن»دا نییە ئەویش لەو شتانەدا کە ئەستووراییی وەیا قولاییی یان هەیە وەک کە دەڵێی «دیوارەکەی دڕی و مەڕەکانی دەرکرد» کەس ناڵێ و نەیگوتوە «دیوارەکەی دڕاند». بە منداڵی لە قوتابخانە کە بمانویستبایە یەکێک قەڵس بکەین دەمانگوت «فڵانەکەس کێوە چوو؟ عاردی دڕی و پێوە چوو». لە لایەن فعلی بەهێزیشەوە کە لە بەندی 2ی گوتارەکەدا لە لاپەرەی 117 باس کراوە منیش و «لێژنەی زمان و زانستەکانی»ش بۆ ئەوە چووین کە فعلی کوردی لە لایەن هێزەوە سێ بەشە:

- یەکەم - فعلی تێپەڕ
- دووەم - فعلی تێنەپەڕی عادەتی [إرادي] وەک: ڕۆیی، هات. هەڵستا... هتاد
- سێیەم - فعلی ڕوودان کە فاعلەکەی دەوری بە خواییشتی خۆی تێدا نابینێت وەک: پسا، سووتا خنکا، کولا... هتاد.

فعلەکانی «مبني للمجهول»یش لە کوردیدا وەک فعلی ڕوودانن هەم لە ڕووی بێهێزییەوە و هەم لە ڕووی تصریفەوە... ئەم بۆچوونانەی من و لێژنەکە لە بۆچوونەکەی ناو ئەو گوتارە دەترازێن، تەواوێکیش لێی دوور دەکەونەوە.

لەبەر ئەم هۆیانە و هی تریش کە پێویست بە باسکردنیان نییە وادەزانم هەقم هەیە بەم نووسینە لە بارەی پاشگری «را» وە بڵێم خەریکە حەشارگەییکی ڕێزمانی کوردی لە نۆژەن ئاشکرا دەکات.

ڕوونکردنەوەییکی کورتیلەی پێویست ماوە:

لە لیستەییکی نموونەاندا گوتم: فعلی «چوو» کە بکرێتە تێپەڕ دەبێتە «چواندی - بردی» فعلی «ڕۆیی» دەبێتە «ڕواندی - هەناردی». بە زاهیر دوو فعلی «چوو - ڕۆیی» «ڕۆییشت» یەک واتایان هەیە، بەڵام بە وردبوونەوە فەرقێکی بنجی لە نێوانیاندا هەستی پێ دەکرێ: کە دەڵێی «ڕۆیی» هەر ئەوەت مەبەستە بڵێی «ئێرەی بەجێ هێشت» مەگەر بە دوا ئەوەدا جێگایەک معلوم کەیت وەک «ڕۆیی بۆ ئەوبەر... بۆ هەولێر... بۆ بازار» بەڵام کە گوتت «چوو» لە سەرەتاوە مەبەستت ئەوەیە بڵێی: «ڕۆیی بۆ جێگایەکی زانراو» لەبەر ئەمە

که یەکێک لەلای تۆوە هەڵستا و بەجێی هێشتی ناڵێی «فلانە کەس چوو» دەڵێی «فلانە کەس ڕۆیی – ڕۆییشت». لەم حاڵەتەدا پێوستە لەگەڵ فعلی «چوو»دا جێگاکەش معلوم بکەیت وەک «فلانە کەس چوو بۆ هەولێر وەیا چوە هەولێر». لەبەر ئەمە کە هاتی فعلی «چوو» بکەیت بە تێپەڕ دەبێ بڵێی «بردی» نەک «هەناردی» چونکە لە وشەی «بردن»دا کابرای کە شتەکەی بردوە لەو شتەی کە بردراوە جودا نابێتەوە و هەمان «معلومیەتی جێگا» کە لە فعلی «چوون»دا هەیە لە «بردن» یشدا پەیدایە. وشەی «هەناردن» بەیەکەوەبوونی کابرا و شتە هەناردراوەکەی تێدا نییە هەروەک لە «ڕۆیین – ڕۆییشتن» معلوومیەتی جێگاکە پەیدا نییە.

دەزانم لەم قسەیەمدا چاوی هەرچی ڕێزمانشناسی کورد هەیە هەڵدەبەزێتەوە، وەک چاوی ئەو فەلەکناسانەی یەکەم جار دیتیان نووسراوە زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە کەچی هەروەک خولانەوەی زەوی ڕاستێکی بێدەمەتەقەی ئەم جیهانەیە پاشگربوونی «را»ش ڕاستییەکی بێدەمەتەقەی ڕێزمانی کوردییە. باوەڕ دەکەم ئەگەر باسی ئەم پاشگرە مسیۆ X وەیا مستر S وەیا پرۆفیسۆر W لە ئەورووپاوە بۆمانی بە دیاری ناردبایە بە چاوێکی ترمان تەماشا دەکرد، کەمتریش لێی دەسڵەمینەوە، کە ئەوەش یەکێکە لە دیاردە بێئەژمارەکانی چاولێکەریمان...

پاشگربوونی ئەم ئەداتەی «کا» بە هەموو ئەو بەڵگانە ئیسپات دەکرێ کە پاشگربوونی «اند» ئیسپات دەکەن: هەروەک دەڵێین پاشگری «اند» بە دوا فعلی تێنەپەڕ وەیا «اسم مصدر» وەیا دەنگی سروشتی وەیا وشەی تری بەواتا و بێواتا دێت و دەیانکات بە فعلی تێپەڕ، هەروەهاش پاشگری «را» بە دوا فعلی تێپەڕدا دێت و دوو هێندەی پاشگری «اند» کاری تێ دەکات:

1- لە معلومەوە دەیکاتە مجهول
2- لە تێپەڕەوە دەیکاتە تێنەپەڕ

تەنانەت ئەو فعلە تێنەپەڕانەی کە «اند» کردبوونی بە تێپەڕ، ئەم پاشگرەی «کا» دێت و سەرلەنوێ دەیانکاتەوە بە تێنەپەڕ ڕێگەش نادا بە «اند» جارێکی تر لە صیغەی مجهولەوە بیانکاتەوە معلوم وەیا لە تێنەپەڕەوە بیانکاتەوە تێپەڕ.

نموونەی وەرگێڕانی فعلی تێپەڕ لە معلومەوە بۆ مجهول و تێپەڕەوە بۆ تێنەپەڕ:

- خواردی – خورا / بردی – برا، – بردرا
- دیتی – دیترا / بیستی – بیسترا

نموونەی گۆڕینی تێپەڕی «اند» بۆ تێنەپەڕ و مجهول:

- برژاندی – برژێندرا / سووتاندی – سووتێندرا
- پساندی – پسێندرا / ستاندی – ستێندرا

نموونەی بێدەسەڵاتیی «اند» لە ئاست ئەو کارەی پاشگری «را» کە فعلان لە تێپەڕەوە بە تێنەپەڕ دەگۆڕێت و معلومان دەکاتە مجهول:

- فعلی: دیترا - دەدیترێ / خورا - دەخورێ

نابێتەوە:

- دیتراندی - دەدیترێنێ / خوراندی - دەخورێنێ

هەروەهاش:

- پسێندرا - دەپسێندرێ / سووتێندرا - دەسووتێندرێ

نابنەوە:

- پسێندراندی - دەپسێندرێنێ / سووتێندراندی - دەسووتێندرێنێ

پاشگری «را»ش وەک پاشگرەکانی «ا، کا، اند» لە ئایندەدا دێتەوە و دەنگەکەی «ا»ی دەبێتە «ێ»:

- دیترام - دەدیترێم / نووسراین - دەنووسرێین

هێزی ئەم پاشگرە، جگە لەوەی کە دوو جاران کار دەکاتە سەر «فعل»، بەوەدا دەردەکەوێ کە فعلێکی سەربەخۆی نوێ دروست دەکات گەردانی ڕابردوو و ئایندەی وێڕای چاوگی، پێوەندی بە فعلە ئەسڵییەکەوە نامێنێت وەیاخود وەک نەمێنێ وای لێبەسەردێ. بە نموونە دەڵێم فعلی «گوتن» کە ڕابردووی، «گوتی» و ئایندەی «دەڵێ»یە، لە شێوەی «مجهول»دا دەبێتە «گوترا، دەگوترێ، گوتران». لەمەدا دەبینی صیغەی «دەگوترێ» لە «گوترا» وەرگیرا کەچی ئایندەی «گوتی» «دەڵێ»یە. هەرچەند لەهجە هەیە «دەڵێرێ - بە واتای دەگوترێ» بەکار دێنێت بەڵام ئەم بەکار هێنانە سەرەڕای کەمبوونی، لە کوێرەڕێگاوە بەرەو دەربڕینی مەبەست ڕۆییشتوە نەک لە شەقامەڕێگاوە چونکە زوربەی زۆرینەی هەموو فعلە مجهولەکان ڕابردوو و چاوگیان لە یەکتر وەر دەگیرێن و هەموویان لە فعلە معلومەکە دادەبڕێن، وەک:

- گیران - گیرا - دەگیرێت
- کوژران - کوژار - دەکوژریێت
- خوران - خورا - دەخورێت
- دیتران - دیترا - دەدیترێت

ئەم تایبەتیەی پاشگری «را» زۆر بە ئاشکرایی لەو فعلانەدا دەردەکەوێت کە «اند»یان بەدواوەیە، ئەمەش چۆنیەتییەکە:

دەزانین فعلێکی «اند»ی هەبێت لە ئایندەدا دەنگی «د»ەکەی دەرناکەوێتەوە وەک کە دەڵێی «دەسووتێنێ، دەبرژێنێ، دەوەستێنێ... هتاد» بەڵام کە فعلەکان بە هۆی «را»وە بوون بە مجهول دەنگەکەی «د» لە ئایندەدا دێتەوە هەر چۆن کە لە ڕابردوودا هەیە وەک «دەسووتێندرێ، دەبرژێندرێ دەوەستێندرێ...». بەڵێ، مومکینە ئەم دەنگەی «د» لە فعلی ئایندەدا بە سەر زارانەوە بسوێت و دەرنەکەوێت و بگوترێ «دەستووتێنرێ،

دەبرژێنرێ» بەڵام سوانی دەنگ لە وشەدا شتێکی زۆر جودایە لە تێچوون و نەمانی چونکە دیتمان لەم حاڵەتەی سواندا مومکینە دەنگەکە تێنەچێ. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێین سوان دوو پلەی لە یەکتر جوداوازی هەیە:

1- سوانی یەکجارەکی کە بە هۆی کۆنبوونی سوانەکەوە وەک تێچوونی لێهاتوە: نموونەی ئەم تەرزە سوانە وشەی «کلۆج»ـە کە لە «کل وجە»ی عەربییەوە هاتوە. بەشێکی بەرچاوی وشەی کوردی کە بە ئەسڵە ئاڤێستاییەکەی بگیرێت ئەم جۆرە سوانەی تێدا بەدی دەکرێت.

2- سوانی کاتێ کە نەگەیشتۆتە پلەی کوشتنی ئەو دەنگەی سوانی بەسەردا هاتوە، وەک کە بە زۆری خەڵق لە جیاتی «هەڵستام» دەڵێن «هەستام». هەر لەم وشەیدا سوانێک هەیە بۆتە یەکجارەکی ئەویش سوانی دەنگی «و»ە کە لە بنەڕەتدا هەبوە و لەبیر کراوە چونکە وشەکە بە ئەسڵ «هەڵوەستام» بوە. سوانی کاتی لە کوردیدا زۆر باوە، هەندێ ناوچەش تێیدا چالاکترە لە ناوچەیێکی تر سەرەڕای ئەوە کە هەندێ دەنگ ئامادەترە بۆ سوان لە هی تر... دەنگیش هەیە خۆی بە هیتر دەگوترێتەوە، کە ئەمانە باسی سەربەخۆن و لێرەدا جێگەیان نابێتەوە و سەر دەکێشنەوە سەر فۆنەتیک و وشەسازی و ڕستەسازی...

لە حاڵەتی دەنگەکەی «د»ی ناو پاشگری «اند» ئەوەی بەسەریدا دێت سوانە نەک تێچوون چونکە بە زۆری دەپارێزرێت: زۆربەی خەڵق دەڵێن «دەسووتێندرێ، دەخنکێندرێ...»، سوانەکەی لەو ناوچانەدا بەرچاوە کە بە عادەت دەنگی «د» دەسوێنن. بەڵام هەمان دەنگی «د» لە فعلی ئایندەی «معلوم»دا بە تەواوی و لە هەموو شوێن و لەهجەیێکدا تێدەبردرێ: هەرچی کورد هەیە دەڵێ «دەسووتێنم، دەبرژێنم، دەڕازێنمەوە.....». کەس ناڵێ «دەسووتێندم، دەبرژێندم، دەڕازێندمەوە...».

یەکێک لە خاسیەتە کانی تری «را» ئەو یە کە وا لە دوو ڕێگەوە فعلی «مجهول» دروست دەکات:

ڕێگەی یەکەم کە هەر خۆیەتی شەقامەڕێگەی دروستکردنی ڕێژەی «مجهول» ئەوەیە لە سەرەتاوە فعلی تێپەڕی ڕابردوو بکرێ بە مجهولی سەربەخۆ و گەردان بکرێ لە هەموو کاتەکاندا وەک لەم نموونانە دەر دەکەوێت:

- پاراستی - پاراسترا - دەپارێسترێ
- کردی - کردرا - دەکردرێ
- بردی - بردرا - دەبردرێ
- بیستی - بیسترا - دەبیسترێ
- خواردی - خواردرا - دەخواردرێ
- بواردی - بواردرا - دەبواردرێ / دەبوێردرێ
- ناردی - ناردرا - دەناردرێ / دەنێردرێ

دەبێ ئەوە بڵێم کە وا هەموو فعلە ئەلفی و یائییەکانی وەک، «نووسین، بڕین، دزین، کێڵان، پێوان هێنان» لە کاتی گۆڕانیان بۆ مجهول ئەلفوبێیەکان تێدەچێت:

- کێڵای - کێڵرا

- پێوای - پێورا
- نووسی - نووسرا
- دزی - دزرا

ئەم «ئەلف» و «ێی»ـیە لە ئایندەشدا تێدەچن بێ ئەوە بکرێن بە مجهول:

- کێڵام - دەکێڵم
- پێوام - دەپێوم
- نووسیم - دەنووسم
- دزیم - دەدزم

بەڵام فعلە واوییەکان لە هەردوو حاڵی مجهول و معلومدا واوەکەیان دەمێنێتەوە:

- فەرمووم - فەرموورام - دەفەرمووم
- گرووم - گروورام - دەگرووم

هێندە هەیە ئەگەر فعلە واویەکە تێنەپەڕ بوو لە کاتی ئایندەدا واوەکەی دەڕوات:

- چووم - دەچم
- بووم - دەبم

بەڵام لەم حاڵەتەدا پێوەندی مان و نەمانی واوەکە بە فعلی مجهولەوە نییە چونکە پێوەندی فعلی مجهول هەر بە تێپەڕەوە هەیە.

ڕێگەی دووەم: ئەو ڕێگەیەیە کە لە هەندێ لەهجەی ئاخاوتنی ناوچەیی، لێرە و لەوێ، پێڕەوی دەکرێت بە وەرگرتنی فعلی مجهول لە ڕێژەی ئایندەی فعلی معلومەوە وەک لەم نموونانەدا دەر دەکەوێت:

- دەبوێرم - «بوێر» - بوێررام - دەبوێرریێم
- دەپارێزم - «پارێز» - پارێزرا - دەپارێزریێم
- دەکەم - «کە - ک» - کرام - دەکریێم
- دەبەم - «بە - ب» - برام - دەبریێم
- دەخەم - «خە - خ» - خرام - دەخریێم

لەم ڕێگەیەدا، بە هۆی ئەوەوە کە ڕێژەی ئایندە (مضارع) لە گەلێک فعلدا گۆڕانی گەورەی بەسەردا دێت، شێوەی فعلە مجهولەکان زۆر دوور دەکەونەوە لە وێنەی ئەسلی فعلە معلومەکان، هەروەها لە لایەن بنگەی

دروستکردنی فعلە مجهولەکانەوە جوداوازییەکی زێدە بەرچاو پەیدا دەبێ لە بنگەی فعلێکەوە بۆ بنگەی یەکێکی تر، بە نموونەی ڕوونکردنەوە دەڵێم لە فعلی «بواردن» ئەو فعلە مجهولەی پێکدێت چ لە ڕابردووەوە وەربگیرێت و چ لە ئایندەوە فەرقێکی زۆر ناکات: لە ڕابردووەوە دەبێتە «بواردرام» لە ئایندەوە دەبێتە «بوێررام - بوێردرام» کەچی لە فعلی «خستن» جارێکیان مجهولەکەی دەبێتە «خسترام» جارێکیشیان «خرام»... هەر ئەم ڕاستییە وا دەکات کە ئەگەر ڕواڵەتی صیغەی ئایندەی زۆر دوور کەوتەوە لە صیغەی ڕابردووی، ناشێ فعلە مجهولەکە لە ئایندە وەربگیرێت وەک ئەوەی کە فعلی «گوتن» ئایندەی دەبێتە «دەڵێم» هەرگیز ناشێ لە صیغەی مجهولی ڕابردوودا بگوترێ «لێرام».

فعل هەیە ڕابردوو و ئایندەی یەک دەقی هەیە وەک «بەستن» کە دەبێتە «بەستم، دەبەستم»، ئەم تەرزە فعلە تەنها یەک ڕێژەی مجهولی هەیە چ لە ڕابردووەوە و چ لە ئایندەوە وەرگیرێت:

- «بەست»م - «بەست»رام - دەبەسترێم
- دە«بەست»م - «بەست»رام - دەبەسترێم

هەرچی فعلێکی «اند» هەیە، بە هۆی ئەم دوو سەرچاوەییە لە دارڕژانی فعلی مجهول، دوو صیغەی دەبێت چونکە دەقی ڕابردووی فعلی «اند» جوداوازیەکی هەیە لە دەقی ئایندەی ئەویش گۆڕانی ئەلفەکەی «ا»یە بۆ «ێ» لە ئایندەدا:

- «سووتاند»ت - «سووتاندرا»یت
- دە«سووتێن»یت (سووتێندرا»یت

لێرەدا، کە قسەمان یەک صیغەیی و دوو صیغەیی دارشتنی فعلی مجهولە، پێویستە بڵێم فعلە ئەلفی و یائی و واویەکان کە نموونەیان لێرە بە پێشەوە خسترایە بەرچاو هەموویان یەک صیغەیان هەیە چ لە ڕابردوو وەربگیرێن و چ لە ئایەندە:

- «کێل»ام - دە«کێڵ»م - «کێڵ»رام
- «نووس»یم - دە«نووس»م - «نووس»رام
- «دروو»م - دە«دروو»م - «دروو»رام

یەکێک لە خاسیەتە باشەکانی ئەم پاشگرەی «را» ئەوەیە کە ئەگەر بکەوێتە دوای ڕابردووەوە ناهێڵێ لە ئایندەی مجهولدا هیچ یەکێک لە دەنگەکانی بسوێت. لێرەدا نموونە لە فعلی «شوشتن» وەردەگرم:

- شوشتم - شوشترام - دەشوشترێم - شوشتران

بەڵام ئەگەر لە صیغەی ئایندەیەوە فعلە مجهولەکەی وەرگرین ئەوسا ئەم گۆڕان و سوانەی بەسەردا دێت:

- دەشۆم - شۆرام - دەشۆرێم - شۆران

ئەم خاسیەتەی پاراستنی دەقی فعلی ڕابردوو لە ئایندەدا کە پاشگری «را» دەیبینێت بە بەریەوە هەیە دەمەتەقە لەسەر باسی ڕەگ و بناغەی فعل و چاوگ...ی بەشێکی زۆر لە فعلەکان کزبکاتەوە، چونکە کە زانیمان لە فعلێکی وەک «شوشتن»دا صیغەی ئایندەی شێوەی مجهولی «دەشوشترێ»یە ڕێگە نامێنێ، وەیا زۆر کورت دەبێتەوە، بۆ شەڕە دندووکێ لەسەر ئەوەی ڕەگی صیغەی ئایندەی فعلەکە ئایا «شۆ»یە یاخود «شۆر»ە چونکە هەروەک «دەشۆم» هەیە «دەشۆرم»یش هەیە. بەڕاستی ئەم حیکایەتەی ڕەگی فعل و ڕەگی چاوگ و ڕەگی ڕابردوو و ئایندە و قەد و بەژن و باڵایان چاوبەستەکێیەکی سەیرمان لێدەکات، چونکە چاوگ و ئایندە و «أمر» و ڕەگ و قەد و هەرچی سەر بە تاکە فعلەوە هەیە یەک ئەسڵ و بنجی هەیە و مومکین نییە هۆشی نەشێواو بسەلمێنێ ڕەگی «کوشتن» شتێکە و هی «دەکوژرێ» شتێکی ترە وەک ئەوەی کە پێوەندی لە نێوان چاوگ و ڕابردوو و ئایندەی فعلەکە نەبێت و هەر یەکە بۆ خۆی لە بنی گۆمێکەوە بڵقی دابێت، لە حاڵێکدا دەزانین و دەبێ بسەلمێنین چاوگ و ڕابردوو و ئایندە و فەرمان و معلوم و مجهول هەموویان لە تاکە سەرچاوەیێکەوە هەڵدەکوڵن، ئەوەی دەشیەوێ بزانێ بۆچی فعلێک لە ڕابردوە بۆ ئایندە سوان و قرتانی بەسەردا دێت دەبێ بگەڕێ بەدوا ئەو دەستوورانەی سوان و قرتان لە وشەی کوردیدا پەیدا دەکەن نەک خۆی لەم ئەرکە بدزێتەوە بۆ بن سێبەری فێنک و ئاسوودەی ڕواڵەتە درۆزنە چاوغەڵەتێنەکەی ڕەگی ئایندە و قەدی رابردوو و نازانم چی. سەیر لەوە دایە ئێمە کە بڵێین ڕەگی ئایندە (مضارع) لە ڕابردووەوە وەردەگیرێ بیر و ڕامان دەخەینە ناو «تناقض»ـێکی بێ دەرفەت چونکە وشەی «ڕەگ» وا ڕادەگەیەنێ ڕەگەکە بنج و ماکی فعلەکە بێت کەچی کە گوتمان لە ڕابردووەوەی وەردەگرین لە ڕەگایەتی دەشۆرێ و دەبێتە وەچە.

فەرموو سەیرێکی ئەم شەڕەدندووکەیە بکە کە لەسەر حیکایەتی ڕەگەوە هەڵدەستێ:

لە فعلی «بردن» صیغەی ئایندە (مضارع) دوو شێوەی زیندووی هەیە: شێوەیێکی «دەبەم»ـە کە زۆربەی ناوچەی خوێندەواری کوردستانی ژێروو بەکاری دێنێت، شێوەیێکی تریشی «دەبەرم»ـە کە لە نێوان هەندێ عەشایری کورد باوە. بەو پێیە هەر یەکێک لەو دوو لەهجەیە بێژەکەی خۆی بە «ڕەگ» دادەنێت: یەکێکیان ڕەگی «بە - ب» ئەوەی تریشیان ڕەگی «بەر». بێگومان خاوەنەکانی ڕەگی یەکەم «بە - ب» بە ئاسانی دەتوانن ئەوانی تر دەمکوت بکەن و هەناسەیان ببڕن چونکە نووسەر و زمانزان و خوێندەواری کوردی لە خۆیانن، مرۆڤێکی ناو شاخ و داخی کوردستان کەی دەزانێ وەیا دەوێرێ دەنگی ئیعتیراز هەڵبڕێ لە ئاست نەعرەتەی خوێندەواران و خاوەن شەهادان.

لەگەڵ ئەمەشدا دەستوورەکانی زمانی کوردی بە خامۆشی و بێ نەعرەتەلێدان پشتگیری لە «دەبەرم» دەکەن نەک «دەبەم» چونکە دەستوورێکی زۆر بەرچاوی «ناوی کارای لێکدراو - اسم فاعل مرکب» لە کوردیدا دەڵێ «باربەر» ڕاستە نەک «باربە»:

- دەبەڕی - باربەر
- دەکوژی - پیاوکوژ
- دەخوا «خواردی» - نانخۆر
- دەگرێ - دەستگرە

کەواتە مەسەلەی ڕەگ ئەو باسە ڕوون و سەلمێنراوە نییە کەوا بێ لێکدانەوەی تەواو و لێ قووڵبوونەوە بۆتە «قضیة مسلمة» لە نێوان زۆربەی زماناسانی کورد.. کە دەشڵێم پاشگری «را» ئەگەر لە ڕابردووەوە فعلی

مجهول دروست بکات دەقی «فعل» دەپارێزێت بێ ئەوەی لە ڕابردووەوە بۆ ئاینده سوانی بەسەردا هاتبێ بیروڕایەکی بێ کێشان و پێوانم دەرنەبریوە، چونکە زۆر لەو فعلانەی ئێستا لە ناوچەیێکی تر کورت و درێژی تێدا پەیدا بوە، شێوە درێژەکەی لەگەڵ ئەو بەشەی پاشگری «را» دەپارێزێت ڕێک دەکەوێت وەیا لێی نزیک دەبێتەوە.

بە نموونە فعلی «شوشتن» دەهێنمەوە کە لە صیغەی مجهولدا دەبێتە «شۆرا» بەپێی بەکار هێنانی لە زۆر ناوچەی کوردستاندا. کەسێک نەختێک شارەزایی بە لەهجە ئاخاوتنەکانی دەشتودەری کوردەواری هەبێت دەزانێ لە زۆر ناوچەدا لەجیاتی «شوشتن» کە لە «شستن»ی فارسییەوە نزیکە وشەی «شۆرین» بە کاردەهێنن و دەڵێن: جلکەکانم شۆری - جلکەکانم بۆ دەشۆرن. لەمەوە دەردەکەوێ صیغەی مجهولی «شۆرا - دەشۆرێ» ڕاستەوخۆ لە «شۆرین»ـەوە هاتوە نەک «شوشتن»، تەنانەت ئەم واوەی «ۆ» کە لە «دەشۆم»دا هەیە چ پێوەندی بە فعلی «شوشتن»ـەوە نییە کە دەزانین واوەکەی تیژە، واتە «و»[2] - (هەندێک نووسەر بە دوو واو «وو»ی دەنووسن) نەک «ۆ». دیارە «دەشۆم» کورت کراوەی «دەشۆرم»ـە کە لە «شۆرین» هاتوە نەک «شووشتن». ئەم ڕاستییە پتر بە صیغەی ناوی کارای لێکدراوی فعلەکە ڕوون دەبێتەوە: دەگوترێ «جلکشۆر» کەس نەیبیستوە بگوترێ «جلکشۆ، جلکشۆش».

فعلێکی تری وەک «بیستن» کە ئایندەکەی لە هەندێ لەهجەدا دەبێتە «دەبیسم» و لە لەهجەی تریشدا دەبێتە «دەبیەم» زۆر بە چاکی - ئیسپات دەبێ کە صیغەی «دەبیسم» ڕەسەنتر و ڕاستتر و ڕێزمانیترە لە «دەبیەم» چونکە هەم ناوی کارای لێکدراو و هەم صیغەی مجهول فعلەکە ئەمە دەسەپێنن:

- ناوی کارای لێکدراو وەک «گوێبیست / گوێبیس»
- صیغەی مجهولی وەک «بیسترا / بیسرا»

کەس نەیبیستوە گوترابێ «گوێبیە / بیەرا». کەواتە ڕەگ و دەق قەدی صیغەی مضارعی فعلەکە «بیس»ـە نەک «بیە» هەرچەند ئەمیشیان کورتتر بێت لەوەی تر. کورتبوون بۆ خۆی بە تەنها ئیسپاتی ڕەسەنبوونی وشە کورتەکە ناکات لە زمانێکی وەک کوردیدا کە یەکێک لە دەستوورەکانی زۆر بنجی و پەرەسەندووی سوان و قرتانی دەنگی وشەکانیەتی: «قەراغ» کورتە و «قەرەداغ» درێژە هەمووشمان دەزانین «قەرەداغ» ڕەسەنە و «قەراغ» کورتکراوەیەتی، ئەگەر نەڵێم غەڵەتەکەیەتی.

لە بارەی ئەو صیغەیەی «اسم فاعل مرکب»ـەوە کەوا زۆر جاران قەد و ڕەگی فعل دەپارێزێت: ئەوەندەی بەدوای نموونادا گەڕابێتم تەنها سێ فعلم دیوەتەوە صیغەی «اسم فاعل مرکب»یان لەلاوە دەنگی «ر» بۆ هاتبێت ئەوانیش فعلەکانی «دان- نان- خستن»ن کە اسم فاعلەکەیان دەبێتە «ناندەر - لێنەر - یەکخەر».

ئەم پاشگرەی «را» جارێکی تریش دەقی فعلەکان نیشان دەداتەوە کە لە پێکهێنانی «ناوی بەرکار» (اسم مفعول) دەور دەبینێت:

---

[2] - لە ڕێنووسی «کۆڕی زانیاری کورد»دا، بۆ «و»-ی درێژ لە بری دوو «و»، پیتی «و»ی کەشیدەبەسەر بەکار دەهێنرا. / سایتی مامۆستا.

هەر وەک ناوی کارا «اسم فاعل» بە زیادکردنی «و» لە کۆتایی فعلی ڕابردووی تێنەپەڕدا دروست دەبێ هەروەهاش «ناوی بەرکار» بە زیادکردنی «و» لە کۆتایی ڕابردووی مجهولدا دروست دەبێت وەک لەم نموونانەدا بەدیار دەکەوێت:

- هات - هاتوو - هەڵستا - هەڵستاو / ناوی کارا
- بیسترا - بیستراو دیترا - دیتراو / ناوی بەرکار

بۆ نموونەی ناوی کارا فعلی تێپەڕم نەهێنایەوە چونکە بەڕاستی تا ئێستا ساغ نەکراوەتەوە ئایا هاتنی «و» بەدوا ڕابردووی تێپەڕدا ناوی کارا دروست دەکات یا ناوی بەرکار:

- گوتوو - کردوو- بردوو - خواردوو - کێڵاو - هێناو - دزیو...

ئەم ڕێژانە بە زاهیر لە فاعل دەکەن بەڵام لە صیغەی ڕابردووی نزیکدا وشەکان دەکەونە گومانەوە لەوەدا ئایا فاعلن یا مفعول؟ بە نموونە دەڵێم «خواردوومە - بیستوومە - کێڵاومە - دزیومە... » ئایا ڕێژەی کارایان تێدا بەکار هاتوە یاخود بەرکار؟ با بێین لە جێگەی ئەواندا وشەی هاوواتای عەرەبی بەکار بهێنین بزانین بەلای فاعلدا دەشکێنەوە یاخود مفعول:

- خواردوومە - «آکل»ـمە - «مأکول»ـمە
- بیستوومە - «سامع»ـمە - «مسموع»ـمە
- کێڵاومە - «حارث»ـمە - «محروث»ـمە
- دزیومە - «سارق»ـمە - «مسروق»ـمە

کە گوتت «نانم خواردوە» چ وشەییکی عەرەبی بەخۆیەوە دەگرێ «نانم آکلە - نانم مأکولە» ئەگەر بڵێین ڕستەی «نانم مأکولە» نانەکە دەکاتە مفعول کە لە حەقیقەتیشدا مفعولە، ئەوسا دوو بەرهەڵست پەیدا دەبێ:

1- «نانم مأکولە» هیچ دەورێکی فاعیلەت ناداتە فاعلەکە، بگرە پێوەندی فاعل بە فعلەکەی «خواردوە» بە جارێ دەپچڕێنێ، ئەمەش ئەنجامێکە سەلیقە نایسەلمێنێ.
2- «نانم مأکولە» بە تەواوی «نانم خوراوە» ڕادەگەیەنێت کە ئەگەر مەبەست وەها با پێویست نەدەبوو بەوەی صیغەی تایبەتی «خواردوە»ی بۆ بەکار بێت.

ئایا کە وازمان هێنا لە ئیحتیمالی مفعولبوونی «خواردوە» بە هیچ تەئویلێک دەتوانین بڵێین لە ڕستەی «نانم آکلە»دا وشەی «آکل» وەک ئەوەیە گوترابێ «نان آکلم - آکلی نانم» بۆ ئەوەی فاعلبوونی وشەکەی «خواردوە» تەوجیهێک وەرگرێت؟ چەند بەسەیری ئەم صیغەیەش خۆی بە حەشارگەیێک نیشان دەدات کە لە بنەڕەتدا مەبەستی نووسینەکەم نەبوو خۆ ئەگەر حەشارگەش نەبێ دەبێ بە مەتەڵێکی ڕێزمانی بڕوات!

بەهەمەحاڵ، لە صیغەیێکی ناوی کارای لێکدراودا وشەکان دەبن بە فاعلی بێدەمەتەقە، وەک نانخواردوو - دنیادیتوو - گەنمدزیو - سەرتاشیو - زەویکێڵاو:

- من نانخواردوەکەم - من نانم خواردوە
- تۆی دنیادیتومان - تۆ دنیات دیتوە
- دارا گەنمدزیو دەرچوو - دارا گەنمی دزیوە

ڕەسەنبوونی هەر سێ پاشگری «ا - کا - را» وەک پاشگری «اند» دیسانەوە لە وشەدا دەردەکەوێ کە بەراورد بکرێن لەگەڵ پاشگری «ەوە»دا.

پاشگرەکانی «ا - کا - اند - را» بە کۆتایی فعلەوە دەلکێن و دەکەونە پێش ڕاناوە چالاکەکانەوە:

- ترسام - ئاڵۆزکام - سووتاندم - دیترام
- دەترسێم - دەئاڵۆزکێم - دەسووتێنم - دەدیترێم

تەرتیبی ئەمانەش لەبەینی خۆیاندا بەم شێوەیەیە: پاشگری «ا» پێش دەکەوێت، بەدوا ئەو دا «کا» دێت، دوای هەموان «را» دێت:

- ئاڵۆزا - ئاڵۆزکا - ئاڵۆزکاندی - ئاڵۆزکاندرا

پاشگری «ەوە» کاتێک بە کۆتایی فعلەوە دەلکێ کە هیچ یەکێک لەو پاشگرانە بە فعلەوە نەبێت و ڕاناوی چالاکیش دیار نەکەوتبێ. دەڵێی:

- هاتمەوە، دیتمتەوە، دیترامەوە، هەڵستاندمتەوە

لەم نموونەی کۆتاییەدا پاشگری «ەوە» سێ قۆناغ لە فعلەکە دوور کەوتۆتەوە، «اند - م - ت».

لە فعلێکی وەک «ئاڵۆزکاندرامەوە» چوار قۆناغ کەوتۆتە نێوان کۆتایی فعل و پاشگری «ەوە»وە «کا - اند - را - م» هەروەهاش لە فعلی «پەشۆکاندرامەوە - پەشۆکاندمیانەوە»....

دەبینی تفاعلی ئەم پاشگرانە لەگەڵ فعلەکەدا وا دەکات لە مقارنەدا پاشگری «ەوە» زۆر بێگانە خۆی بنوێنێ بەنیسبەت فعلەکەوە. پاشگری «ەوە» سەرەڕای دوورکەوتنەوەی لە فعلەکە کە دیاردەیێکی بێگانەتییە، تێکەڵ بە تەکوینی فعلەکەش نابێت چونکە هەم لە فعلەکە جودا دەبێتەوە، لە ئایندەشدا وەک خۆی بێ گۆڕان دێتەوە، کەچی «ا - کا - اند - را» لە صیغەی ئایندەی فعلدا، دەبنە «ێ - کێ - ێن - رێ».

من لەم نموونانەدا ئینکاری پاشگربوونی «ەوە» ناکەم، بە پێچەوانە، دەمەوێ لەگەڵ دانهێنان بە پاشگربوونی، پایەی هێز و بێهێزیشی دەرخەم لە چاو پاشگرەکانی تر، بەمەشدا نیمچە وەرامێکی ئەو زمانشناسانە دەدەمەوە کە وا دەزانم لەبەر ڕانەهاتنیان لە دانهێنان بە «ا - کا- را»، زۆریان بەلاوە ئەستەم دەبێ دوابەدوای ئەم نووسینە دانی پێدابهێنین، ئەمەش دیاردەیێکە لە هەموو کات و شوێنێکدا ڕووی داوە، گەلێک جارانیش مەیلی نەسەلماندنی شتی نامەئلووف وای کردوە لە مەیدانی زۆر گرنگی زانستی تەتبیقیدا بەرهەمی داهێنان و دۆزینەوە بەدرەنگەوە پێشوازی و خۆشامەدی لێبکرێ.

من بۆ ئەوە دەچم ڕێژەی تری فعل هەبێ لە بنەڕەتدا بە هۆی هاتنی پاشگر لە کۆتایی وشەوە پەیدا بووبێت، بەڵام وردە وردە لەگەڵ دوورکەوتنەوەی سەرەتای داهاتنی ئەو ڕێژانە بنەچەکەی پێشگرەکە کوێر بووبێتەوە و بە پارچەیێکی بنجی فعلەکە حیساب کرابێت: یەکێک لەوانەی گومانی پاشگربوونی لێ دەکرێت جووتە دەنگی «سا»یە کە لە کۆتایی گەلێک لە فعلەکاندا دێت وەک:

- ترسا، نووسا، دارِسا، ڕاسا، پسا، ئاوسا، تاسا، چرووسا، چەوسایەوە...

ئەم فعلانە سەر لە بەریان لە ڕواڵەتی ئێستاکەیاندا شکڵی یەک وشەیی یان وەرگرتوە و «سا»کەی کۆتایی یان لە پاشگر ناکات بەڵام فعلێک هەیە پێ دەچێ «سا» کەی پاشگر بێت ئەویش فعلی «گیرسانەوە» بەواتای «بەندبوون بەجێگایەکەوە» وەک لەم نیوە بەیتەدا دەردەکەوێ:

ئاخۆ بە چ شاخێکەوە گیرساوە دڵی من

زۆر ئاشکرایە ئەم وشەیە لە بنکەی «گیر» و پاشگری «سا» پێکهاتوە. بە وردبوونەوە دەردەکەوێ دەنگی «س» لە کۆتایی گەلێک وشەدا دەوری «وصفية» دەبینێ وەک :

- جارِس، قەڵس، وەڕس، ئاوس، مەکس [خەبەرەکە مەکس بۆوە]، خاوس...

کە ئەمە وابێ دوور نییە «سا»ش پاشگر بووبێت لە بەشێکی ئەو فعلانەدا بەڵام وردەوردە بە کەرتێکی بنجی فعلەکان حیساب کرابێت...

ئەو زمانشناسانەی لە حیکایەتی ڕەگ و قەدی کار دەدوێن و دەڵێن کورتترین بەشی ئەو قەد و ڕەگانە بنجی ئەسڵی کارەکەن دەبێ کەمتر ڕەخنەم لێ بگرن و پتریش بەدوا قسەمدا بێن لەوەدا کە دەڵێم لەوانەیە «سا» پاشگر بێت چونکە بە پێی بیروڕای ئەوان لادانی «سا» لە فعلەکان بەشێکی کەمیان لێ دەهێڵێتەوە کە زۆر گونجاو دێت لەگەڵ واتای «ڕەگ»: بە نموونە دەڵێم ئەگەر بسەلمێنین لە فعلی «کردن» دا صیغەی ئایندەی کە کورتترین ڕەواڵەتیەتی بکەین بە ڕەگ و بنجی وشەکە و بڵێین «دە «کە» م» نیشانەی موزاریع و ڕاناوی لێ وەرگرینەوە «کە - ک» دەمێنێتەوە بۆ ڕەگ، دەبێ بسەلمێنین لە فعلی «نووسا»شدا ڕەگەکە «نو»ە و «سا»یەکە پاشگرە هەروەک لە «ئاڵۆزەکا» دا «ئاڵۆز» بنجە و «کا»ش پاشگرە. من کە لە یەکێک بسەلمێنم لە فعلی «بردم، دەبەم» ڕەواڵەتی «بە - ب» لە صیغەی موزارعدا کورتترین بنجی کارەکەیە و گوێ نەدەمە «بردن - بردم، دەبەرم... » دەبێ ئەو کەسەش بێ خۆ خوراندن بسەلمێنی، بگرە مەمنوونیش بێ، کە بڵێم لە فعلی «نووسا»دا «نوو» بنجی فعلەکەیە و «سا»ش لە لاوەی خۆی پێوەلکاندوە..

3 - حەشارگەی «فعلی انتقالي» و «انتقالي پێچەوانە»

ئەم زاراوەیەی «انتقالي» یەکەم جار لەلایەن خۆمەوە بەکار هاتوە، لە بەشێکی گوتاری «بەکارهێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردی» کەوا لە یەکەم ژمارەی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بڵاوکراوەتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ، زاراوەکە لە ڕێی ناچارییەوە خۆی بە سەرمدا سەپاند چونکە لە دەمی نووسینی گوتارەکەدا، لەویش بەپێشەوە، وشەیێکی لەبارترم بەبیردا نەهات بیکەم بە زاراوە بۆ ئەم دیاردەیەی زمانی کوردی کە تایبەتییێکی خۆیەتی و لە زمانانی تری دوور و نیزیک [لەوانەی لێیان ئاشنام] وێنەی پەیدا نییە. وا دەردەکەوێ، هەروەک «مافتیء و مابرح، مالبث..» جۆرە فعلێکن تەنها لە زمانی عەرەبی بەکار دێن، هەروەها فعلی «چوومە خانوەکە. دەیچمێ..» و ئاواڵەکانی تری وەک خۆی ماڵی بێ هاوبەشی زمانی کوردین تەنانەت فارسی کە مەشوورە زۆر لە کوردی نزیکە ئەم جۆرە فعلانەی تێدا نادیترێ.

لە بارەی زاراوەکەوە، ئەگەر وشەی کوردی لەبار، یاخود وشەی بێگانەی لە بارتر چەنگ کەوێ پێویستە بەو بگۆڕدرێتەوە چونکە من لە وشەی «انتقال» مەبەستم تەنها ئەو فعلانە نییە کە بزووتنی ڕاستەقینەیان تێدا بێت بەڵکوو ئەو فعلانەش بەر زاراوەکە دەکەون کە بزووتنەوەی مەعنەوی وەیا ئیعتیباریان تێدایە و بەشدار دەبن لەو خاسیەت و تایبەتییانەی کە شەقڵی ئەم جۆرە فعلانەن. ئەم فعلانەی ڕستەکانی خوارەوە هیچیان بزووتنەوەی ڕاستەقینەیان تێدا نییە بەڵام جۆرێک تەئسیر لە لایێکەوە بۆ لایێکی تر دەبەن هەرچەند تەئسیرەکەش مەعنەوی و ئیعتباری بێت نەک ماددی، وەک:

- دارام کردە پشکنێر
- نۆڕیمە خانوەکە
- بوویتە پیاو
- قسەم گوتە دراوسێکەم
- دایە گریان

هەبوونی واتای بزووتن و «انتقال»ی مەعنەوی و ئیعتباری لەو فعلانەدا باشتر هەستی پێ دەکرێت کە بەراورد بکرێن لەگەڵ بەکارهێنانی عادەتییاندا:

- من بووم دەم نووسی - من بوومە نووسەر
- خانووم دروست کرد - خانوەکەم کردە ئۆتێل
- دەنۆڕم کەس نابینم - نۆڕیمە باغەکە
- گوتم بەزیاد بێ - گوتمە دارا پارەت بداتێ
- جۆم دا نەک گەنم - جۆم دایە ئازاد

بەشێکی زۆر لەو فعلانە واتای بزووتنەوەیان تێدایە وەک فعلەکانی:

- دان، هەناردن، بردن چوون، گەییشتن، هاتن، کەوتن، خستن، ترنجان..

بەڵام لەشێوەی بەکار هێنانی انتقالیدا جۆرە تاو و تەئسیرێکی تازە بەرەو ئامانجێکی دیارەوە دەردەبڕن وەک لەم ڕستانەدا دەردەکەوێ:

- کەوتم و هەڵستامەوە - کەوتمە ناو دەغڵەکەوە
- دەچم نان دەکڕم - دەچمە ماڵی مامم
- دەنکە تەزبیحەکە دەترنجێ و دەردێتەوە - دەنکە تەزبیحەکە ترنجایە ڕیزی دەنکەکانی ترەوە
- تۆ نەهاتی شەکر بکڕێت - تۆ نەهاتییە هەڵپەڕکێ
- ئازاد دوێنێ گەییشت - ئازاد گەییشتە ئامانج

باسی فعلی «انتقالي» لە گوتارەکەی خۆم «بەکارهێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردیدا» کراوە، هەر لەو گوتارەشدا چەند لایەنێک و خاسیەتێکی ئەم فعلانە باس کراون، دەوری 12-13 فعلیش لەو گوتارەدا دۆزراوەتەوە. مامۆستا تەوفیق وەهبی لەکتێبەکەی *«دەستووری زمانی کوردی»* - جزمی یەکەم، سالی 1929 دا، بە جۆرێکی یەکجار خێرا و لە گۆشەیێکی تەسکەوە باسی بابەتێکی ڕێزمانی کردوە کە پەیوەندی بە فعلی «انتقالي»یەوە هەیە، لە بەندی 47 لاپەڕە 10ی کتێبەکەدا بزوێنی «ە- ئە»ی کۆتایی فعلی ناو ئەم ڕستەیەی «ئەچمە ماڵەوە»ی بە «ئەداتی تەواوی» داناوە. لە لاپەڕەی 22ی کتێبەکەدا بەپێی ڕاگەیاندنی نموونەکان دەردەکەوێت مەبەست لە «ئەداتی تەواوی» ئەو وشانەن کە لە عەرەبیدا پێیان دەگوترێ «حروف الجر». لە ڕستەی «تۆ کاغەزێکت بە پۆستەدا نارد» وشەیێکی «بە - دا» بە «ئەداتی تەواوی» دانراوە هەروەهاش وشەی «لە»ی ناو ڕستەی «مناڵەکە لە هەیوان نووست». من، دوای نەختێکی تر، بەو جۆرەی هەموو ڕاگەیاندنێکی دوور و نیزیکی ئەم ڕایەی مامۆستا وەهبی بگرێتەوە لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆمی بەراورد دەکەم، ڕەنگە لەم هەوڵەشدا مەیدانێکی بەرفرەوانتر بە ڕایەکەی مامۆستا وەهبی بگرمەوە لەوەی ناو کتێبەکەی.

بەپێی ئەوەی کە جارێکیان خۆم لەبارەی ئەو فعلانە شتێکم نووسیبێت و مامۆستا تۆفیق وەهبیش بەر لەمن باسی کردبێتن هەر دەڵێی مافی ئەوەم نەمابێ ناوی «حەشارگە» بکەمە عنوانی ئەو جۆرە فعلانە. بەڵام هەروەک لە درێژەی نووسینەکەم دەردەکەوێ چەند لایەنێکی نوێ لە لێکۆڵینەوەی ئەمجارەدا کە لەمەوپێش نەهاتۆتە ناو نووسینانەوە ڕێ دەدا باسەکە بکەوێتە ژێر ناونیشانی «حەشارگە». لە ئاست نووسینەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی نووسینی ئەمجارە لە چەند ڕوویەکەوە نوێیەتی خۆی بەرچاو دەکات:

1- نووسینەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی تایبەتیە زۆر جوداکەرەوەکەی سیفەتی «انتقالي»ی ئەم فعلانەی باس نەکردوە. بێدەنگبوون لەم لایەنە وەک ئەوەیە مرۆڤ بێدەنگ بێ لە جۆری تێپەڕ و تێنەپەڕی فعل.
2- نووسینی مامۆستا وەهبی کە بزوێنەکەی «ە» دوای فعلەکانی داناوە بە «حرف جر» لە دوو خاڵی زۆر گرنگی تایبەتی فعلەکان، بەتێکڕایی، چاو دەپۆشێت:

a) لەوەدا کەوا بەشی کەمی فعلەکان هەڵدەگرن بزوێنەکەیان بکرێتەوە بە «حرف جر» وەک فعلی «بوون - کردن - گەییشتن - دان - گوتن...» ئەمەش هەردوو جۆری بەکارهێنانی فعلەکانە:

- بوومە ئەندازیار - بووم بە ئەندازیار
- تۆم کردە وێنەگەر - تۆم کرد بە وێنەگەر
- گەیشتینە ئاوات - گەییشتین بە ئاوات
- پارەکەم دایە وەستا - پارەکەم دا بە وەستا
- گوتمە براکەم - گوتم بە براکەم

فعلیش هەیە دەشێ بزوێنەکەی ببێتە «لە، تێ» وەک؛

- بەردم گرتە چوێلەکە - بەردم لە چوێلەکە گرت
- گرتمێ - تێم گرت

بەشی زۆری فعلەکان هەڵناگرن بزوێنەکەی ئینتقالییان بگۆڕێ بە «حرف جر» وەک ئەمانەی لیستەی ژێرا:

- نۆڕیمە خانوەکە
- چوومە کوێستان
- خستمە خوارەوە
- کەوتە سەر زەوی
- هاتەوەماڵێ
- هەڵکشامە سەری شاخ
- ترنجایە ڕیزەوە
- هەستامە سەر پێیان...

b) لەوەدا کەوا لە حاڵی بزربوونی «مفعول» بزوێنەکە دەبێتە «ێ». هەرچەند ئەم جۆرە بەکارهێنانە لە سلێمانی کەم بۆتەوە بەڵام لە ناوچەکانی تری کوردستان زۆر باوە. نموونەی بزربوونی فعلەکان ئەمەیە:

- بەردم گرتە چوێلەکەکان - بەردم گرتنێ
- کەوتمە باغەکەوە - کەوتمێ
- نۆڕێمەوە ئێوە - نۆڕێمنێ

ئەم بەکار هێنانە لێرە بە پێشەوە لە سلێمانیش دیتراوە، وەک لەم دێڕە شیعرەی نالی دەردەکەوێ:

وای فەرموو کە ماچت نەدەمێ ڕووڕەشی تۆ بم
ئەمساڵە بەجێ دێ ئەسەری وەعدەیی پاری

«نالی» گوتی «ماچت نەدەمێ» نەیگوت «ماچت پێ نەدەم»...

حاجی قادر دەڵێ:

خانەقاکەی کەنەفی ئەمنە ئەدەبخانەیی عام
جێی قەزای حاجەتە عالەم بە زەرووری دەچنێ

«حاجی» نەی گوت «تێی دەچن».

بەیتی فۆلکلۆری دەڵێ:

هەی زێڕینێ و زێرینێ
کۆیێ خۆشە بابچینێ

کە دەڵێم لە حاڵی بزربوونی مفعول بزوێنەکە دەبێتە «ێ»، مەبەس بزربوونی ئەو مفعولەیە کە لە شکڵی «انتقالي» بەکارهێنانی فعلەکە دەردەکەوێ نەک ئەو مفعولەی کە لە بنەڕەتدا بۆ فعلی تێپەڕ دێتە ناو ئاخاوتن. لە ڕستەی «بەردم گرت» بەردەکە مفعولی عادەتییە بزربوون و دیارکەوتنی کار ناکاتە سەر فعلەکە، واتە کە بەردەکەت لە ڕستە دەرهاویشت دەڵێی «گرتم». بەڵام کە فعلەکەمان کردە «انتقالي» دەڵێین «بەردم گرتە چوێلەکە». لێرەدا «چوێلەکە» مفعولی «انتقالي»یە، کە لامان برد دەڵێین «بەردم گرتێ». ئەم شکڵە انتقالییە لەگەڵ «ڕاناوی لکاو» دەردەکەوێتەوە هەر چەند ڕاناوەکە مفعولیش بێ، واتە دەرکەوتنی مفعول لە وێنەی ڕاناوی لکاو مەنعی هاتنی «ێ» کە ناکات وەک کە دەڵێی «بەردتان دەگرمێ - بەردم گرتنێ - بەردت گرتمێ.. هتاد».

ئەمەش یەکێکە لە خاسیەتەکانی ڕاناوی لکاو کە لە شتی تری جواد دەکەنەوە، چ ناو بێ و چ هەر یەکێک لەو وشانە بێ بەر تاقمی ناو دەکەون وەک «ڕاناوی نەلکاو، ئاوڵناو». لەبەر ئەم خاسیەتە زێدە تایبەتیانەشە کە من دەمەوێ بەو ڕاناوانە بڵێم «چالاک» نەک «لکاو».

3- مامۆستا وەهبی لەوەش نەدواوە کە فعلەکان لە حاڵەتی «انتقالي»دا مفعولێک بۆ فعلەکە دەهێنن، جا ئەگەر تێپەڕ بێت دوو مەفعولی دەبێت، ئەگەر تێنەپەڕیش بێت یەک مەفعول، وەک لەم نموونانە دەردەکەوێت:

- تێنەپەڕ
  - چووم - چوومە سەفەر
  - بووم - بوومە یەکەم
  - هات - هاتە کەرکووک

- تێپەڕ
  - پارەم خست - پارەم خستە گیرفانمەوە
  - دزم گرت - بەردم گرتە دزەکە
  - ئاو دەهێنم - ئەسپەکە دەهێنمە تەویلە

ئەمە لە بارەی نووسینەکەی مامۆستا وەهبییەوە. بە نیسبەت نووسینی لێرە بە پێشەوەی خۆشمەوە لە چەند ڕوویەکەوە نوێیەتی نووسینی ئەم جارە دەردەکەوێ:

1- ئەو ڕوونکردنەوەیەی کە دەری خست مەبەست لە «بزربوونی مفعول» تەنها مفعولە ئینتقالیەکە، هەروەها دەرکەوتنی ئەو ڕاناوە چالاکەی جێی مفعولە انتقالیەکە دەگرێتەوە «بەردیان دەگرمێ - بەردەم گرتنێ».
ڕوونکردنەوەکە لە کۆتایی خاڵی «2- ب» لە بەسەردا چوونەوەی نووسینەکەی مامۆستا وەهبی باس کرا.

2- لەلایەن ئەو فعلانەی دەشێ ببنە «انتقالي»: لە گوتارەکەی پێشوومدا 12 فعلێکم دەست نیشان کردبوو، لەم نووسینەمدا ژمارەیان بۆ پتر لە دوو هەند تێهەڵدەکشێ، وا لێرەدا فعلەکان دەخەمە لیستەوە دەشزانم فعلی تری وەک ئەمانە ماون بدۆزرێنەوە:

فعلی تێنەپەڕ:

1. بوون
2. چوون
3. کەوتن
4. هاتن
5. داهاتن [بە واتای «انقضاض» وەک: باز داهاتە کۆترەکە - دادێتە کەوەکان]
6. گەییشتن
7. خونجان
8. پەسوان
9. تکان
10. خزان
11. ترنجان
12. ڕژان
13. هەڵکشان
14. خشین [مارەکە خشیە ناو گیاکە]
15. پەڕین

فعلی تێپەڕ:

1. کردن
2. بردن
3. خستن
4. گرتن
5. هەناردن
6. دان
7. هەڵدان [هەڵ مەدەیێ - هەڵدەداتە قسان]
8. گوتن [گوتمە دارای وەرە ئێرەکانە]
9. هێنان [هێنامەماڵەوە - هێنامە ڕەدایێ]

10. داهێشتن [پەیژەکەم داهێشتە حەوشەکەوە]

دەتبەمە سەر ئاوە گردی
داتدەهێڵمە کابرای کوردی

ئیقباڵی خۆت ئەی مەلکەقۆڕ
ئەگەر ژیای ئەگەر مردی

11. نان [نایە بانیەوە]

لە پاش بۆسیدەن و بۆییدەنی تام
نیامە سەر سەر و چاوم بە ئیکرام

12. خزاندن
13. ترنجاندن [دانەکەم ترنجاندە ڕیزی ئەوانی تر]
14. پەسواندن
15. ویران [وێرامە ئازاد]
16. هاویشتن.

3- ئێستا کە بە تازەیی دەڵێم: ئەو فعلە ئینتقالیانەی تێپەڕن کە دەکرێن بە «مبني للمجهول» یش بە بەریانەوە هەیە لە شکڵی «انتقالي» بمێننەوە، هەردوو مفعولیشیان لەگەڵدا بێت، وەک:

- دارەکە خرایە خانوەکەوە
- پارەکە درایە خانوەکەی

مفعولی ئەسڵیش جێی فاعل دەگرێتەوە.

بەڵام لێرەدا یەک دوو تێبینی کورتیلە هەیە، ئەوانیش هەر نوێن:

یەکەمیان لەبارەی فعلی «هەڵدان» - بە واتای خۆ لە قسان «هەڵقوتاندن».

ئەم فعلە چ لە شێوەی «مبني للمعلوم» بێت و چ لە شێوەی «مبني للمجهول» بێت یەکێک لە دوو مفعولەکان دەردەکەوێت، تەنانەت وا دەبێ تاکێکیشی دەرناکەوێت. کە دەڵێی: «کەس ڕووی لەو نەبوو ئەو لەخۆوە هەڵی دایێ» هێچ مفعولێک دەرنەکەوت. کە گوتت «لە خۆوە هەڵی دایە قسان» یەک مفعول دەرکەوت. لێرەدا مفعولەکەی دیکە بە شێوەیێکی شرایەوە لەناو مفهومی قسەکەدا دەبێت وەک ئەوەی گوتبێتت «قسەم هەڵدایە قسان - ڕەخنەم هەڵدایە ناوقسان..». ئەم تەرزە وردەکارییە لە هەموو بابەتێک پەیدا دەبێ نەک تەنها بابەتی زمان، پەیدابوونیشی بەڵگەی دەوڵەمەندی ئەو سەرچاوەیەیە کە لێی هەڵقوڵیوە.

تێبینی دووەم لە باری فعلی «وێران»ـە کە بە پێی سروشتی واتاکەی وا دەبێ وەک تێپەڕ تصریف دەکرێ واش دەبێ وەک تێنەپەڕ. کورد هەن دەڵێن:

- وێرامان - وێراتان - وێرای - وێرایان - وێرات

کە ئەمە تصریفی تێپەڕە. هی تریش هەن دەڵێن:

- وێران، وێرا، وێرات، وێرایان

ئەمەش تصریفی تێنەپەڕە. هەر ئەمانەی کە وەک تێنەپەڕ تصریفی دەکەن لە «نفی»دا دەڵێن:

- نەوێرام، نەوێراین، نەوێرا، نەوێران، نەوێرایت

ئەگەر وەک تێپەڕ با دەبوو بڵێن:

- نەموێرا، نەمان وێرا، نەیوێرا، نەیانوێرا، نەتانوێرا، نەتوێرا

بەلای باوەڕی منەوە ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە «وێران» بەسەر شتی ماددیدا نایەت، زۆرینەی ئەوەی بەر «وێران» بکەوێت مەعنەوی و ئیعتیبارییە وەک:

- وێرام لە ڕووبارەکە بپەڕمەوە
- دەوێرم لە تاریکی بڕۆم
- کەس ناوێرێ بڵێ لەل
- نەوسن بە خۆی ناوێرێ...

بە سرنج دەردەکەوێ واتای وێران هێندەی «ڕۆیشتن، هاتن، هەڵستان....» یش کردەوەی ماددی تێدا نییە هەرچەند فعلی تێنەپەڕیشن. دیسانەوە «وێران» وەک فعلە تێپەڕەکان نییە کە مفعول دەخەنە پێش خۆیانەوە وەک:

- کاغەز دەنووسم
- نانم خوارد
- پارەمان دۆزیەوە... هتاد.

دیارە خاسیەتە تایبەتیەکەی «وێران» کە وەها بکات دوو جۆرە تصریفی هەبێ وەک تێپەڕ و تێنەپەڕ، ڕێی ئەوەی لێ دەبەستێ کەوا لە حاڵی «انتقالي»دا وەک فعلی تێپەڕ داوای دوو مفعول بکات. لە ڕاستیدا «وێران» بە زۆری دەبێتە خاوەن مفعولی «اعتباري» کە بریتییە لە ڕستە نەک لە مفعولی بەرهەست:

- وێرام بڕۆم
- وێرام بازدەم
- وێرایان «مارەکە بکوژن»
- دەوێرن چوار ڕۆژان لەسەر شاخەکە بمێننەوە

- کەس ناوێرێ «سەیری چاوی بکات»

هەموو ڕستەکانیش فعلی «انشائي»یان تێدایە کە ئەمەش یەکێکە لە خاسیەتەکانی فعلی «وێران» و بەشێکی لە فعلی کوردی دەشێ پێیان بگوترێ فعلی یاریدەر «الفعل المساعد- auxiliary» وەک:

- هاتم بڕۆم، نەیانهێشت
- گوتم بیڵێم، نەموێرا
- هەستام خۆم بشۆم، ئاوەکە سارد بووبۆوە
- ویستم بنووم، لێم نەگەڕان... هتاد

کەواتە فعلی «وێران» ئەم خاسیەتانەی هەن:

1. بەزۆری لە بەکارهێناندا مفعولی «اعتباري» کە بریتییە لە ڕستەی «انشائي» دەهێنێتە ناو ڕستەوە.
2. مفعولەکانی ناکەونەوە پێش خۆی، بە پێچەوانە فعلی تێپەڕی عادەتی کە هەمیشە مفعولەکەی پێش خۆی دەکەوێتەوە.[3] فعلی «نۆڕین» ئەویش لە حاڵێ «انتقالي»دا مفعول بەدوایدا دێت وەک «نۆڕیمە خانوەکە». ئەگەر بەشێوەی عادەتی لەکار بێت دەڵێی «خانوەکەم نۆڕی».
3. یەک مفعول قەبوڵ دەکات، لەمەشدا وەک تێنەپەڕ کار دەکات.

تێبینی تریش هەن بەرانبەر «وێران» وەک ئەوەی کە ئەگەر بە فعلی دیکەی خزمی خۆی بگیرێت لەوانەی کاریگەرییان ماددی نییە دەبینین فعلەکانی تر مفعولەکانیان پێش خۆیان دەیەخن: فعلی «گوتن، زانین، بیستن، ناسین» کاری ماددی ناکەن بەڵام وەک هەموو فعلێکی تێپەڕ ڕەفتار دەکەن هەم لە ڕووی تصریفەوە هەم لە ڕووی پێش خستنی مفعولەکانیانەوە:

- قسەمان بیست
- خەبەرتان زانی
- شیعریان گوت
- خەڵقمان ناسی

ئەم کۆمەڵە فعلە - هی تریش هەیە - وەک فعلەکانی «خواردن، کردن، بردن، کوشتن... » تەئسیری ماددی لە مفعولەکانیان ناکەن، دیارە «وێران» یش هەر لەو بابەتەیە بەڵام بە شێوەیێکی بێهێزتر.

لەم خاسیەتەی نامادديبوونی تەئسیری «وێران»ـەوە تێبینیەکی تری گرنگ هەڵدەستێ: دەشێ ئەم فعلە بە هۆی «اند» جارێکی تریش ببێتەوە تێپەڕ وەک کە بڵێی «دارا نەی دەوێرا، من وێراندم»...

---

[3] - دەبێ لێرەدا بڵێم هەموو مفعولە انتقالیەکانی فعلی تێنەپەڕ بەدوا فعلەکاندا دێن: چوومە ماڵێ، دەکەومە خوارەوە، گەیشتینە ئامانج...

فعلەکانی تری انتقالي، ئەوانیش بەشێکیان، تێبینی هەڵدەگرن، بەڵام لەم نووسینەدا جێگەی هەموو لێکۆڵینەوەیێک نابێتەوە، بۆیە چیتریان لەسەر نارۆم.

4. نە لە نووسینی مامۆستا وەهبی و نە لە نووسینی خۆمدا باسی ئەم لایەنە یەکجار گرنگ و بنجییە نەکراوە کە فعلی انتقالي دوو جۆری پێچەوانەی یەکتری هەیە، جۆرێکیان ئەوە بوو لێی دواین، جۆری دووەمی ئەوەیە کە دەبێتەوە حەشارگەیێکی سەربەخۆی ڕێزمانی کوردی هەرچەند بەپێی ئەو دەورەی فعلەکان دەیبینن ڕاستەوخۆ دەکەونە ڕووبەڕووی «فعل انتقالي» یەوە هەر دەڵێی وێنەی نیگاتیڤی ئەون.

فعلی «انتقالي پێچەوانە» کۆمەڵێکن لەو فعلانەی لە شکڵی پێچەوانەیاندا لە لاوە تین و تاوێک بۆ سەر کارا (فاعل)ی خۆیان دەهێنن و دەیانخەنە جێگەی بەرکار (مفعول)ـەوە. فعلە انتقالیەکان تاو و تینێکی تازەکردیان لە کارەوە بۆ مفعولێکی تازەکرد دەبرد، لە وێنەی پێچەوانەدا دیمەنەکە پێچەوانە دەبێ و لە مفعولێکەوە تین و تاو بۆ فاعل دێت.
من تا ئێستا لە ئەنجامی بەدوادا گەڕاندا ئەم فعلانەم دۆزیوەتەوە کە کاری پێچەوانە دەکەن، فعلەکانیش لە صیغەی ئایندە (مضارع) دا دەهێنمەوە چونکە دیاردەکە لەو صیغەیەدا سەرنجڕاکێشە:

1. دەمدزێ [بە واتای بەلامەوە دزێوە]
2. دەمپەرژێ
3. دەمەوێ
4. دەمئێشێ
5. دەمبێ
6. دەمکەوێ [حصەم دەکەوێ]
7. دەمچێ
8. دەمیێ (دەمهێ - لە هاتنەوە)
9. دەمخورێ

لەم فعلانە تەنها فعلی «دەمەوێ» لە جۆری تێپەڕە ئەوانی تر هەموویان تێنەپەڕن. گەلێک لەوانەی تازەبەتازە دەکەونە ناو و وتووێژ و ئاخاوتنی کوردییەوە کاتێک ئەم فعلەی «دەمەوێ» بەکار دەهێنن قیاسی دەکەن لە فعلی تری تێپەڕی وەک خۆی و دەڵێن «دەوێم» وەک کە لە ئایندەی «بیستن» دا دەڵێن «دەبیەم»:

- بیستم - دەبیەم
- ویستم - دەوێم

ئەم فعلەی «دەمەوێ، دەمانەوێ»، بارە پێچەوانەکەی باشتر ڕوون دەبێتەوە کە لە تەک فعلی تری عادەتی تێپەڕدا تصریف بکرێن، بۆ نموونە چەند ڕستەیێک دەهێنمەوە:

- دەتەوێن - تۆ ئەوانت دەوێت

- دەتبینن - ئەوان تۆ دەبینن
- دەمەوێن - من ئەوانم دەوێت
- دەمبینن - ئەوان من دەبینن

لە هەر دوو فعلی «دەتەوێن، دەمەوێن» ڕاناوەکانی «ت، م» کە لە دوای نیشانەی مضارعەوە هاتوون لە جێگەی مفعولدا هەڵکەوتوون کەچی لە واتادا فاعلن، هەروەها لە هەردوو فعلدا ڕاناوی «ن» جێگەی فاعلی گرتۆتەوە کەچی مفعولیشە، بەڵام لە فعلەکانی «دەتبینن، دەمبینن» کە فعلی تێپەڕی عادەتین ڕاناوەکانی «ت، م» مفعولن و لە جێگەی مفعولیشن، ڕاناوەکەی «ن» یش فاعلە و لە جێگەی فاعلیشدایە.

سەیرێکی مەعنا لێدانەوەی فعلەکان بکە لە سەرەوەدا ڕوون کرانەوە:

لە بەرانبەر «دەتەوێن» دا نووسراوە «تۆ ئەوانت دەوێت»، کەچی لە بەرانبەر «دەتبینن»دا نووسراوە «ئەوان تۆ دەبینن». ئەم مەعنا لێدانەوانە ڕاستن بەڵام ئەگەر فعلەکان یەک جۆربوونایە نەک جۆری عادەتی و پێچەوانە، دەبوو ڕاناوەکان لە هەر دوو فعلدا بە پێی قیاس لە یەکترکردن ئەم شکڵەیان هەبوویایە:

- تۆ ئەوانت - دەو «ێت»
- ئەوان تۆیان - دەبینـ «ێت»

خۆ ئەگەر قیاسەکە لە فعلە عادەتییەکەوە هەڵستابایەوە دەبوو فعلەکان و ڕاناوەکانیان بەم جۆرە بن:

- ئەوان تۆ دەبینن
- ئەوان تۆ دەوێن
- تۆ ئەوان دەبینیت
- تۆ ئەوان دەویت «یاخود دەویستیت»

سەیر لەوەدایە فعلی «ویستن» لە ڕابردوودا وەک فعلەکانی تری تێپەڕ ڕەفتار دەکات و لەوان جوداواز نییە:

- ویستم - پارەم ویست - بمویستبایە...
- دیتم - پارەم دیت - بمدیتبایە...
- بیستم - قسەم بیست - بمبتستبایە...

وا دەزانم فعلی «ویستن»ی زاری کرمانجی خواروو ئەگەر هەر خۆی مابایەوە بۆ ئایەندە، دەبوو صیغەی ببێتە «دەوێم، دەویسم» هەروەک «بیستن» دەبێتە «دەبیەم، دەبیسم». واپێ دەچێ لە ئایندەدا صیغەی «ئەڤین»ی زاری کرمانجی سەروو دێتە جێگەی ئایندەی «ویستن» بەڵام بە شێوەی «ئینتقالی پێچەوانە» نەک شێوەی

عادەتی خۆی، ڕەنگە هەر بۆیەش بێ لە «دەمەوێ، دەتەوێ، دەیانەوێ...»دا ئەم بزوێنەی «ە» بەدوا ڕاناوەکەدا دێت چونکە کورتکرایەوەی «دەم ئەڤێ - دەت ئەڤێ - ئەوێ، دەتان ئەڤێ - ئەوێ»ن[4].

گوتمان زۆریش ئاشکرایە، صیغەی «دەم ئەوێت - دەمەوێت» بە تەواوی وەک «دەم بیەت - دەم بینیت» وایە. ئەگەر واتاکەی «انتقالي پێچەوانە» نەبوویایە دەبوە «دەمخوازێت»:

- دەمەوێت - دەمخوازێت
- دەمەوێن - دەمخوازن
- دەتەوێم - دەتخوازم
- دەمانەوێن - دەمانخوازن

ڕەنگە لە شێوەیێکی تەرجەمەی فعلەکە بۆ سەر عەرەبی نەختێک بەرەو ڕوونبوونەوە بڕوات: دەزانین ڕستەی «دەمەوێیت» بە واتای «أريدک» دێت، بەڵام لە تەرکیبدا بە پێی جیگەی فاعل و مفعول لە ڕستەی کوردی و عەرەبیدا وەک ئەوەیە گوتبێتت «تريدني». جا ئەگەر ئێمە فعلێکی تری عەرەبی بێنین کە تەرکیبەکە و واتاکەی وەک «دەمەوێیت»ی کوردی بێت کەمێک یارمەتی خۆمان دەدەین بۆ زیاتر ئاشنابوون لە واتای فعلە کوردییەکە. لە عەرەبیدا فعل هەن ئەم دەورەی ڕوونکردنەوە ببینن وەک «تعوزني، تستميلني...». ئەوانیش لەڕیزی فعلی تری عەرەبی وەک خۆیان باشتر مەفهووم دەبن:

- تسمعني - دەم بیەیت
- تراني - دەم بینیت
- تعوزني، تستميلني - دەمەوێیت

بەڵام دەبێ ئەوە بزانین چونکە فعلەکانی عەرەبی لە باری «پێچەوانە» بەکار نەهاتوون، مومکینیش نییە بەکار بێن، ناتوانن بەتەواوی وەک فعلە کوردییەکە ڕەفتار بکەن. لە کوردیدا دەڵێین «من دەمەوێیت». لە عەرەبیدا هەرگیز خەیاڵ بۆ ئەوە ناڕوات بگوترێ «أنا تُعوزني، تستميلني». ئەم ئیمکان نەبوونە لە فعلی کوردی عادەتیش هەر بەرچاوە: کەس نەیگوتوە و ناشێ بڵێ «من دەمبینیت». هەرچەند لە تەرکیبیشدا وەک ڕستەی «من دەمەوێیت» داڕژاوە، هەر ئەمەیشە داخوازی سروشتی «پێچەوانەیی» لەو تەرزە فعلە «انتقالي»یانەدا.

دیاردەی وەک گۆڕانی فعلی «ویستن» بۆ «ئەڤین» لە ئایندەدا کە سەرچاوەیان جودایە و واتایان یەکە، فعلی تری کوردیشدا دێتە بەرچاو.

یەکێک لە فعلە یەکجار بەکارهاتوەکانی کوردی کە ڕابردوو و ئایندەیان لە دوو سەرچاوەوە دێن فعلی «دیتن»ـە کەوا لە بەشێکی زۆری کوردستانی ژێرووەدا صیغە ئایندەکەی لە فعلی «بینین»ـەوە وەردەگرن وەک ئەم نموونەیە ڕوونی دەکاتەوە:

- بینیم - دەبینم

---

[4] - لە «نووری عەلی ئەمین»م بیستوە دەڵێ، لە شارەزوور صیغەی ئایندەی «ویستم» دەبێتە «دەویسم». من ئەمەم لە ڕۆژی 4-10-1976 بیست، ئەوسا چەند ڕۆژێک بوو دەست کرابوو بە لەچاپدانی ئەم نووسینە. مەسعوود محەمەد.

- دیتم - دەبینم

کوردی کوردستانی ژێروو لە هەندێ ناوچەدا دەڵێن «دیتم - دەدینم» کە ئەمە بەکارهێنانی ڕاست و دروست و ڕەسەنیشە، بەڵام ناوچەکانی تر سەیریان لەم بەکارهێنانە دێتەوە کەچی لە هی خۆشیان پەسەندترە.

فعلی تریش هەن صیغەی ئایندە لە هی تر بخوازنەوە وەک:

- ڕۆییم - دەڕۆم
- ڕۆییشتم - دەڕۆم
- دێرام - دەدێرم (بە واتای ئاودان)
- داشتم - دەدێرم (بە واتای ئاودان)

فعلێک هەیە لە «داشتن»ـەوە پەیدا دەبێ، وەک ئایندەکەی لە «دێران»ـەوە وەردەگیرێت، کەچی کەموزۆر پێوەندی بە واتاکەیەوە نییە: «هەڵداشتن» بەواتای «فڕێ دانەخوار»ە وەک کە دەڵێی «لە شاخیم هەڵداشت»، ئایندەکەشی دەبێتەوە بە «هەڵدەدێرم»... لە لایەن واتاوە فعلی «هەڵداشتن» کە تێپەڕە خزمی «هەڵدێران»ـە کە فعلێکی لازمی ڕوودان (مطاوعە)یە.

هەڵدێران لە تصریفدا بە پێی ئەوە کە فعلی ڕوودانە، جودا دەبێتەوە لە فعلی «دێران» کە تێپەڕە و بە واتای «ئاودانی شیناورد»ە:

- دێرام (ئاوم دا) - دەدێرم
- هەڵدێرام - هەڵدەدێرێم

«هەڵداشتن»یش چونکە تێپەڕە هەر دەچێتەوە سەر «دێران» و دەبێتەوە «هەڵدەدێرم». جگە لە «هەڵداشتن» کە تێپەڕی «هەڵدێران»ـە فعلی «هەڵدێراندن»یش تێپەڕکردنی فعلی «هەڵدێران»ـە بە هۆی پاشگر «اند»ەوە.

ئەم ڕوونکردنەوانەی دوایی پێوەندی بە «انتقالي پێچەوانە» وە نییە، بەڵام هەڵبواردنیان لە زەرەر بەولاوە شتێکی تری تێدا نەبوو. بۆیە بوو نەختێکیان لەسەر ڕۆیشتم.

بەکار هێنانی سەرلەبەری فعلەکانی تریش وەک هی «دەمەوێ، دەمانەوێ»یە لە ڕووی ئەوەوە کە ڕاناوی «فاعل» دەکەوێتە شوێنی «مفعول»:

- دەمەوێ، دەمدزێ، دەمپەرژێ، دەمخورێ، دەمئێشێ، دەمبێ، دەمکەوێ - دەمچێ - دەمێ [دەمهێ - لە هاتنەوە].

لەمانە چواریان:

1- بوون
2- کەوتن

3- چوون

4- هاتن

شێوەی انتقالیشیان هەبوو. لەم لیستەیەی خوارەوە هەر دوو شێوە بەکار هێنانیان بە سەریەکەوە دەهێنمەوە بۆ ئەوەی لە تەک یەکتردا باشتر ڕوون ببنەوە:

شێوەی انتقالي – شێوەی انتقالي پێچەوانە

- دەبمێ – دەمبێ
- دەکەومێ – دەمکەوێ
- دەچمێ – دەمچێ
- دەیێمی – دەمیێ

لە شێوەی انتقالیدا تاوی فاعلەکە بۆ سەر مفعولێک دەڕوات [لەم نموونانەدا مفعولەکە دیار نییە]، لە شکلی پێچەوانەدا لە لاوە تاو بۆ سەر فاعلەکە دێت هەر وەک لە فعلە پێچەوانەکانی تریشدا هەمان ديارده شتێکی بەرچاوە.

بە نموونە چەند فعلێکی عادەتی دەخەمە صیغەی «انتقالي» و «انتقالي پێچەوانە» تاکو جارێکی تریش جوداوازی ئەم فعلە ناعادەتییانە لە غەیری خۆیان دەرکەوێت. فعلی: نووستن، سووتان، برژان... ئەم فعلانە شێوەی «انتقالي» و «انتقالي پێچەوانە»یان نییە. ئەگەر شیابا لەو شێوانەدا بەکار بێن دەبوو بگوترێ:

انتقالي – انتقالي پێچەوانە

- نووستمە ژوورەکە، نووستمێ – دەمنوێ، دوو سەعاتان دەمنوێ
- سووتامە ئاگرەکە، دەسووتێمێ – دەمسووتێ، ئاگرەکە دەمسووتێ
- برژامە گۆشتەکە، دەبرژێمێ – دەمبرژێ، گۆشتەکە دەمبرژێ

نموونەم لە فعلی تێپەڕ نەهێنایەوە چونکە فعلی تێپەڕ کە بخرێتە لیستەی «انتقالي پێچەوانە» واتا بەدەستەوە دەدات بەڵام واتایەکی عادەتی نەک «انتقالي پێچەوانە» ئەوساش لەوانە بوو مرۆڤ بە سەهو وابزانێ نموونەکە دەستوورەکەی تێکداوە. من کە فعلی «خواردن» بکەمە نموونە لە شێوەی «انتقالي»دا ئاشکرایە کە واتا نادات بەڵام لە پێچەوانەدا واتای عادەتی دەبێت:

انتقالي – انتقالي پێچەوانە

- خواردمە گۆشت – دەمخوا، گۆشت دەمخوا، گۆشتم دەخوا

دەبینی لە شکڵی پێچەوانەدا «دەمخوا» واتای هەیە لەبەر ئەمە دەشێ خوێنەری شلک تێیدا بەسەهوو بچێت و دەستوورەکەی لێ بشێوێت، ئەوساش بۆ ئەوە بچێت کە هەڵە لە هێنانەوەی وشەی «گۆشت» پەیدا بوە، ئەگەر بگوترابایە «گورگ دەمخوا» ڕستەکە ڕاست دەردەچوو: بەڵێ دیارە «گورگ دەمخوا» گوتەیێکی ڕاست و دروستە بەڵام لە شکڵی پێچەوانەدا نییە، فەرموو بە «دەمەوێ»ی بگرە:

- گورگ دەمخوا - پارە دەمەوێ

پوختەی گوتە و دەستووری ئەم فعلانە ئەوەیە، چ تێپەڕ بن چ تێنەپەر، دەبێ لە بەکارهێنانیاندا «انتقال» وەیا «انتقالي پێچەوانە» یان تێدا بێت، ئەگەرنا دەبنەوە فعلی عادەتی. سەیری فعلی «کەوتن» بکە لە شێوەی پێچەوانەیدا: کە دەڵێی «دەمکەوێ» مەبەستت ئەوەیە بەش و حصەت دەکەوێ، واتە لە شتێکەوە مافێک بۆت دەگەڕێتەوە. ئەگەر ئەمە نەبێ و «خانوو کەوتن» بێ فعلەکە لە شێوەی عادەتی خۆیدا بەکار دێت و بیر بۆ هاتنەوەی تاو و تەئسیرێک لە خانوەکەوە بەرەو تۆ وەیا خاوەنەکەی ناڕوات. بە نموونەی لەکار هێنانی شێوەی پێچەوانەی فعلی «کەوتن» سەیری ئەم چەند ڕستەیە بکە:

- ئەرێ تۆ چەندت لە میراتەکە دەکەوێ؟
- نیوەم دەکەوێ
- لەم خانوە تۆ ناتکەوێ برات دەیکەوێ!
- نەخێر، منیش دەمکەوێ

کە بڵێم «تۆ خانووت دەکەوێ» وەک ئەوەیە گوتبێتم «تۆ مەڕت دەزێ» وەیا «تۆ پارەت بزر دەبێ، لە هیچ یەکێک لەم فعلانەوە چ تاووتینێک لە «خانوو، مەڕ، پارە» بەرەو تۆ ناگەڕێتەوە تاکو بگوترێ ئەمانە فعلی انتقالي پێچەوانەن.

ئەم فعلانەی لە لیستەی سەرەوودا ژمارەیان گەیشت بە 9 و ناوم نان «فعلی انتقالي پێچەوانە» دەبێ بخرێنە بەر تیشکی ئەم تێبینییانە:

1. لە کوردیدا، بێگومان، فعلی تر هەن دەوری پێچەوانە ببینن بەڵام من بۆیان نەچووم وەیاخود لەو شێوەی ئاخاوتنەی من شارەزاییم پێیان نییە فعلە پێچەوانەکانیان بەر ئەم نووسینە نەکەوتوون.
2. هەر یەکێک لەو فعلانە لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی دەوێت بۆ ئەوەی لە هەموو بارێکیەوە ڕوون ببێتەوە. فعلی «پەرژان» کە من لێرەدا وێنە پێچەوانەکەیم باس کردوە، لە شێوە ئاخاوتنی تردا بە جۆرێکی عادەتی ڕەفتار دەکات. لە جێگەییکی وەک کۆیێ دەڵێن «نەپرژام بچم بۆ سەفەر - ناپەرژێم خانوەکەم سواغ بدەم» کە ئەمە بەکار هێنانێکی عادەتییە، واش دەبێ دەکرێتە فعلی «انتقالي» و دەگوترێ «ناپەرژێمە سەر ئەم کارە» کە لەمەدا واتای «پێچەوانە» پەیدا نییە.
3. ئەوەی لەم فعلانە دەکۆڵێتەوە دەبێ ئاگاداری خۆی بێت لێی تێکەڵ نەبن. لە فعلێکی وەک:

   - دەمبێتی، دەمکەوێتێ، دەمچێتێ، دەمگاتێ، دەمداتێ، دەمڕوانێتێ، دەمکاتێ، دەمگرێتێ...

خەیاڵ بۆ ئەوە دەڕوات صیغەکان درێژەپێدراوی صیغەی «انتقالي پێچەوانە» بن چونکە «دەمبێ، دەمکەوێ، دەمچێ» پێچەوانەن. جارێ باسی «دەمبێتێ» ناکەم چونکە نەختێک درێژەی هەیە، بەسەریدا باز دەدەم بۆ ئەوانی تر و دوایی بۆ ئەو دەگەڕێمەوە.

فعلی «دەمکەوێتێ»: ئەم صیغەیە «انتقالي»یە و فاعلەکەی کەسی سێیەمی تاکە، مەفعولەکەشی کەسی یەکەمی تاکە. کە بێین صیغەکە بدەین بە کەسی یەکەم دەڵێین «دەیکەومێ». لەم صیغەیەدا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک کە دوای نیشانەی «دە» دێت و بریتییە لە «ی» بوە بە مفعول هەروەک ڕاناوی کەسی یەکەمی تاک لە صیغەی «دەمکەوێتێ» مفعول بوو. هەر چۆن دەڵێی «دەمکەوێتێ» دەتوانی مفعولەکە بگۆڕیت بە ڕاناوی کەسەکانی تر:

- دەیکەوێتێ، دەتکەوێتێ، دەمانکەوێتێ، دەتانکەوێتێ، دەیانکەوێتێ

هەرواش دەتوانی بەپێی داخوازیی حاڵ ڕاناوەکان بکەیت بە فاعل وەیا مفعول وەک کە بڵێی:

- دەمکەونێ، دەیانکەومێ، دەتکەومێ، دەمکەوێتێ، دەتانکەوینێ، دەمانکەونێ.....

هەروەهاش فعلەکانی تر دەشێ ڕاناوەکان تێیاندا فاعل وەیا مفعول بن وەک:

- دەتگرمێ، دەمگرێتێ، دەیانگرمێ - دەمگرنێ دەتانگرنێ، دەمانگرنێ، دەیانگرینێ...

لێرەدا تێبینیەکی بنجی هەیە لە بارەی گۆڕانی ڕاناوەکان لە فاعلەوە بۆ مفعول: ڕاناوی کەسی یەکەم کۆ و تاکی، نابن بە مفعولی ڕاناوی کەسی یەکەم. هەروەهاش ڕاناوی کەسی دوەم هیچیان نابنە مفعولی ڕاناوی کەسی دوەم. ناگوترێ:

- دەمبینم - دەمانبینم
- دەمانبینین - دەمانبینم
- دەتکەیت - دەتانکەیت
- (ئێوە) دەتانکەن - (ئێوە) دەتکەن

لە نموونەی چوارەمدا ڕاناوی «ئێوە»م نووسی تاکوو معلوم بێ صیغەکە هی کەسی دوەمی کۆیە نەک هی سێیەمی کۆ چونکە ڕاناوی فاعل بۆ کەسی سێیەمی کۆ و کەسی دوەمی کۆ لە فعلی ئایندە (مضارع)دا هەر «ن»ـە. کە بڵێم «دەتانکەن» لەوانەیە واتاکەی «ئەوان ئێوە دەکەن» بێت، کە بشڵێم «دەتکەن» دەشێ «ئەوان تۆ دەکەن» بێت.

لە حاڵەتێکدا بمانەوێ کەسی یەکەم ببێتە مفعول بۆ کەسی یەکەم وەیا کەسی دوەم ببێتە مفعول بۆ کەسی دوەم دەبێ «خۆ» بچێتە پێش ڕاناوی نەلکاوی کەسەکەوە و تەرکیبێکی «اضافی» هەردوویان ببێتە مفعول، وەک:

- من خۆم دەبینم، من خۆمان دەبینم، تۆ خۆت دەبینیت، تۆ خۆتان دەبینیت، ئێمە خۆمان دەبینین، ئێوە خۆتان دەبینن

دەشگوترێ:

- خۆم خۆم دەناسم، خۆمان خۆمان دەناسین، خۆتان خۆتان دەناسن....

ئەم دروست نەبوونەی گوتەی وەک «من دەمبینم، ئێمە دەمانبینین» لە لاپەڕەی 463ی بەشی یەکەمی بەرگی سێیەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا باس کراوە تەعلیلێکیشی بۆ هاتۆتەوە بەپێی داخوازی دەمەتەقەی ئەو جێگایە[5] بەڵام ڕەواندنەوەی گرفتەکە گەلێک لەوەی پتر دەوێ کە لەو شوێنەدا ڕوونم کردۆتەوە، تەنانەت لێرەشدا دەرفەتم نییە خۆم لە ئەسڵی باسەکەی «انتقالي پێچەوانە» بدزمەوە تاکو تەعلیلێکی تەواو بهێنمەوە بۆ دروستبوونی «من خۆمانم دیت - تۆ خۆتانت دیت» و دروست نەبوونی «ئێمە خۆمان دیت - ئێوە خۆتتان دیت»، واتە بۆچی دروستە تاک ببێتە «فاعل»ی ئەو گروپەی خۆی یەکێکە لە وان، کەچی «گروپ» نابێتەوە «فاعل» بەسەر تاکێکی خۆیدا.

کە بێینە سەر کەسی سێیەمی تاک و کۆ، لەوێدا حاڵەت بە تەواوی دەگۆڕێ، تۆ دەتوانی بڵێی:

- ئەو دەی بینێت - ئەو دەیان بینێت - ئەوان دەیانبینن - ئەوان دەیبینن

بەڵام دەبێ بزانین لێرەدا فاعلەکە عەینی مفعولەکە نییە، واتە ڕاناوە نەلکاوەکە هەر خۆی نییە دەبێتە ڕاناوی لکاو، بەڵکوو هەر یەکەیان کەسێکی جودان. کە گوتت «ئەو دەی بینێت - ئەو دەیان بینێت» وەک ئەوەیە بڵێی «دارا حەمە دەبینێت - دارا مەڕەکان دەبینێت». ئەگەر ویستت بڵێی «دارا دارا دەبینێ» دەبێ لێرەشدا «خۆی» بەکار بهێنیت:

- دارا خۆی لە ئاوێنەدا دەبینێت - ئەوان خۆیان دەناسن- دارا خۆیان دەژمێرێت

واتە ئەو گروپە دەژمێرێت کە خۆی یەکێکە لەوان. ئەمەش لەو قابیلەتانەیە کە «غائیبوون» پەیدای دەکات چونکە «ئەو» بۆ هەموو تاکێکی غائب دەست دەدات هەروەهاش «ئەوان» بۆ هەموو گروپێکی غائب دەست دەدات لە هەمان ڕستەدا، بەڵام «من، تۆ» تەنها بۆ یەک تاک دەست دەدەن، «ئێمە، ئێوە»ش تەنها بۆ گروپێک دەست دەدەن لە هەمان ڕستەدا.[6] وەک دەبینیت تازەیی باسی ڕێزمان لە کوردیدا بە بەریەوە هەیە لە زیمنی «حەشارگە»یەکی باسلێنەکراودا حەشارگەیێک و دوانی تر دەرکەون. ئیتر با بگەڕێینەوە بەرەو باسی ئەسڵیمان.

نموونەی بەکار هێنانی جۆری «انتقالي»مان لە «دەمکەوێتێ - دەمگرێتێ» هێنایەوە کە ئەم تەرزە صیغەیە لەم دوو فعلە و ئەوانی تریشدا پێوەندییان بە «انتقالي پێچەوانە» وە نییە. بەڕاستی سەرلەبەری فعلەکان، چ پێچەوانە و چ غەیری پێچەوانە»، دەبێ هەرتاکەیان بە جۆرێکی سەربەخۆ لێی بکۆڵرێتەوە و سروشتی تایبەتی هەر یەکەیان ڕوون بکرێتەوە چونکە بە هۆی باری یەکجار لەعادەتبەدەری ئەم فعلانە لایەنی زۆر ورد و نازکیان تێدا دەدیترێتەوە کەوا لە فعلی عادەتیدا هەرگیز پەیدا نییە، جگە لەوەی کە تازەیی باسەکە، وێڕای وردی و نازکی، لە پێداویستی لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوەیان زیاد دەکات.

---

[5] - دواتر کە لێکۆڵینەوەکان خرانە شکڵی کتێب لە ژێر عنوانی *«ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لێژنەی زمان و زانستەکانی»* ئەم تەعلیلە کەوتە لاپەڕە 64ی کتێبەکە.

[6] - لە گوتاری *«سوورێکی خامە بە دەوری «ڕاناو»دا»* کە لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بڵاو کرایەوە باسم کردوە کەوا هۆی زۆربوونی «ڕاناو» لەلایەن بیروڕای نووسەران ئەوەیە کە صفەتی «غیاب» وا دەکات وشەیێک جێگەی وشەیێکی تری «غائب» بگرێتەوە. کە گوتارەکە بوە بەشێکی کتێبی *«وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی»* ئەم باسەی تەئسیری «غائیبوون» کەوتە لاپەڕەکانی 90-89ی کتێبەکە.

به نموونه فعلی «دەمچێ» به واتای «پارەم دەچێ، مەسرەفم دەچێ - زەرەرم لێ دەکەوێ» له تصریفدا زۆر بەرچاوه که فعلێکی «انتقالي» پێچەوانەیه چونکه لەو بارەدا نەبێ ناشێ ڕاناوی «م» بچێته دوای نیشانەی ئایندەوه چونکه معلومه به ئەسڵ فعلەکه «دەچم»ـه، لەباری «انتقالي»دا دەبێته «دەچمێ - دەچمه خانوەکە»، دیاره «دەمچێ» هیچ کامێکیان نییه و له ڕیزی فعلەکانی تری وەک خۆیەتی که ئەوانیش ڕاناوی فاعلیان له باری پێچەوانەدا دەچێته دوای نیشانەی ئایندەیانەوه. ئەم شێوه بەکار هێنانه که نه له عادەتی و نه له «انتقالي»دا نایەته بەرچاو فعلەکه دەخاته ڕیزی «انتقالي پێچەوانه» هەرچەند له ڕووی واتاوه هێندەی بەشێک له فعلەکانی تر «دەمەوێ، دەمخورێ، دەمئێشی...» فاعلبوونی ڕاناوەکەی «م» هەستی پێ ناکرێ. «دەمچێ» که له واتادا «زەرەرم لێ دەکەوێ وەیا پارەم دەچێ»یه، له دوو ڕووەوه ڕاناوەکەی به فاعل حیساب دەکرێ:

یەکەم: که له بەکار هێنانی «پێچەوانه»ی دەرهاوێیت و له جیاتی «زەرەرمەندبوون و پاره و مەسرەف چوون» له واتایەکی عادەتیدا سەیری کەیت. که مەبەستت ئەوه بێ بڵێی «برام دەچێ - نەک پاره و زەرەر» هەرگیز ناتوانی فعلەکه بکەیته پێچەوانه و براکه حەزف کەیت و بڵێت «دەمچێ» چونکه براکه له حیسابی خۆیەوه چوونەکه دەکات نەک بەزەرەری تۆ.

دووەم: که به حاڵەتی «انتقالي» خۆی بگرێت و بەکار هێنانه پێچەوانەکەی لەگەڵ انتقالیەکەی بەراورد بکەیت، له پێشەوه جۆری «انتقالي» سەیر دەکەین:

- دەچم: ئەی خانوو ئەگەر کۆنیش بیت دەتچمێ - لێرەدا ڕاناوی کەسی دووەم مفعوله و هی کەسی یەکەم فاعله.
- دەچێت: ئەی کێچ هەرچی بکەم دەمچیتێ - لێرەدا ڕاناوەکان جێگەیان به یەکتر گۆڕییەوه له فاعلیەتەوه بۆ مفعولیەت.

ئەم جار باری پێچەوانەی:

- دەمچێت: ئەی پاره چەندی دەست دەپارێزم هەر دەمچێت

لەم بەکار هێنانەدا ئەو «ێ»ـه که بەدوا فعلی «انتقالي»دا دێت دەرنەکەوتەوه، بۆیەیه له کەسی دووەمەوه تەئسیرێک دەگەڕێتەوه بۆ کەسی یەکەم که ئەگەر لەباری پێچەوانەدا نەبوویایه کەسەکەی یەکەم دەبوو به مفعولی ڕاستەقینه [ئەی کێچ دەمچیتێ].

بۆت دەردەکەوێت فاعلبوونی ئەو ڕاناوەی جێگەی مفعولی گرتۆتەوه [به دوا نیشانەی مضارعدا - دەمچێت] له بەراوردکردن و مەبەستی گوتەکەوه دەردەکەوێت دەنا به زاهیر فاعلی ڕێزمانی له ڕستەی «دەمچیت»دا ڕاناوەکەی کەسی دووەمه «یت» هەروەک له «دەچێت» دا کەسی دووەمه.

له فعلی وەک «دەمخورێ، دەمئێشێ» سروشتی فعلەکان و ئەو مەبەستەی له باره پێچەوانەکەیاندا نیازی قسەکەره، وا دەکەن له خەیاڵدا شتێک هۆی هەستی «خوران و ئێشان» بێت دەنا له ڕواڵەتدا و له ناو دەقی ڕستەکاندا هیچ وشه پەیدا نییه ئەو دەوره ببینێت. لەم بەکارهێنانەدا «دەشی خورێ و دەشی ئێشێ» شەبەنگ و تارمایی فاعله ڕێزمانییەکه دەردەکەوێت نەک فاعلەکه، بەڵام ئەگەر فعلەکان به عادەتی بێنه ناو ڕستەوه فاعلەکان بۆخۆیان دەردەکەون نەک تارماییان وەک که بڵێی «دەستم دەخورێ، سەرم دەئێشێ» دوو وشەی

«سەر، دەست» فاعلی عادەتین، کە گوتیشت «دەمخورێ، دەمئێشێ» لە خەیاڵدا شەبەنگی شتێک دەبێتە هۆی «خوران، ئێشان».

بگەڕێمەوە بۆ فعلی «دەمبێ، دەمانبێ»:

لەم فعلەدا قابلیەتێک هەیە پتر بەولای خاسیەتی «انتقالي»یەوەی دەبات، قابلیەتەکەش لەوەوە دێت کە هەندێک وشە هەن بە بەریانەوە هەیە ڕێ خۆش کەن لەبەر فعلی «بوون»دا تەئسیری خۆی بە دەوروبەردا بپژێنێت، ئەمەش چۆنیەتیەکەی:

- دەڵێی «بوومە پاڵە»

لەمەدا فعلی «بوون» بە جۆرێکی عادەتی لە شکڵی «انتقالي» بەکار هاتوە، کە مفعولەکەت لادا دەڵێی «دەبمێ». لەم حاڵەتەدا پاڵەیی ئەوپەڕی بوونەکە دەگرێتەوە و چی تری بەدوادا نایەت، لەبەر ئەمە ناتوانی بڵێی «دەیبمێ» بەڵام ئەگەر بابەتی «بوون»ـەکە خزمایەتی تێدا بێت، کە دەکاتە پێوەندی نێوان دوو لایەن، ئەوسا بەکارهێنانی «بوون» وێنەیێکی هەڵدەگرێت کە ئیشارەت بۆ پێوەندییەکەی تێدا دەرکەوتبێت وەک لەم نموونانەدا دەدیترێ:

- تۆ نابیتە خوارزای دارا
- بەڵێ دەبمە خوارزای - بەڵێ دەیبمێ

لێرەدا ڕاناوی «ی» کە لە دوای نیشانەی ئایندەوە هاتوە هەمان ڕاناوی اضافەی کەسی سێیەمی تاکە کە لە ڕستەی یەکەمدا «دەبمە خوارزای» بەدوا وشەی «خوارزا»وەیە کە بەپێی دەستووری گشتی فعلە «انتقالي» یەکان لە ڕستەی «دەیبمێ» دا ئەگەر بەدەری بخەینەوە دەبێ بڵێین:

- دەیبمە خوارزا- دەیبمە خزم

لە فعلەکانی تردا، وەک کە بڵێی:

- دەگەمە دارا - دەیگەمێ
- دەچمە بازاڕ - دەیچمێ
- دەنۆڕمە جادە - دەینۆڕمێ..

ئەم ڕاناوی «ی» کە لە پاش نیشانەی ئایندەوە هاتوە لە هەموو فعلەکاندا هەر خۆیەتی ڕاناوی مفعولی «انتقالي» نەک «مضاف الیە» بۆ مفعولی انتقالي [خوارزای]. لە ڕستەی «دەیگەمێ» مفعولێک نەماوەتەوە لە خەیاڵدا بیری لێ بکەینەوە، بەڵام لە ڕستەی «دەیبمێ»دا مفعولێک ماوە و بزر بوە ئەویش مفعولەکەی «خزم، خوارزا، مام، برا...»یە کە هەر ئەو مفعولی «انتقال»یە.

بێگومان زۆر شتی تر ماوە قسەی لێ بکەین بۆ دەرخستنی خاسیەتی تاک تاکی فعلەکان وەک کە بڵێین لە وشەی «کردن» واتا «انتقالي»یەکە لە گۆڕینی شتێک بە شتێک ئەو انتقالە ڕادەگەیەنێت دیارە فەرقەکەش لەوەوە دێت «کردن» تێپەڕە و «بوون» تێنەپەڕە وەک کە «گۆڕین و گۆڕان» یەکەمیان تێپەڕ و دوەمیان

تێنەپەڕە. ئەگەر ڕێ بە خۆم بدەم بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوە وشەی عەرەبی بەکار بهێنم دەڵێم فعلی «کردن» «جَعلْ» ڕادەگەیەنێت فعلی «بوون» یش «صیرورة - أیلولة» ڕادەگەیەنێت.

تێبینیەکی زۆر بنجی و گرنگ لە شێوەی «انتقالي» و «پێچەوانە» ئەوەیە تصریفی فعلی پێچەوانە هەمیشە وەک فعلی تێپەڕ دەکرێت هەرچەند زانیمان لەو کۆمەڵە فعلەی پێچەوانەدا تەنها فعلی «ویستن- دەمەوێ....» تێپەڕە، ئەوانی تر سەرلەبەریان تێنەپەڕن. لەم لیستەیەی خوارەوە تصریفی هەندێک لە فعلی پێچەوانەی تێنەپەڕ دەهێنمەوە کە وەک تێپەڕ ڕەفتار دەکەن: فعلی «بوون، دزان» دەکەم بە نموونەی بەراوردکردن [دزان هەر شێوەکەی پێچەوانەیەی هەیە]. «بوون» لە شێوەی عادەتی تصریف بکرێت دەبێتە «بووم، دەبم - بووین، دەبین...». لە شێوەی پێچەوانەدا:

- ئەرێ منداڵتان بوو؟ بەڵێ بوومان - نەخێر نەمانبوو
- ئەرێ منداڵیان دەبێ؟ بەڵێ دەیانبێ - نەخێر نایانبێ
- ئایا جلکە چڵکنەکانتان دزان؟ بەڵێ دزامانن - نەخێر نەماندزان
- ئایا داراتان دەدزێ؟ بەڵێ دەماندزێ - نەخێر ناماندزێ

ئەم تصریفە وەک ئەوەیە بگوترێ:

- ئەرێ نانتان خوارد؟ بەڵێ خواردمان - نەخێر نەمانخوارد
- ئایا مەڕەکانتان فرۆشت؟ بەڵێ فرۆشتمانن - نەخێر نەمانفرۆشت

سەیری چۆن لەم فعلە تێنەپەڕانەدا «بوومان - دەیانبێ - دزامانن - ناماندزێ..» ڕاناوی فعلی تێپەڕ و صیغەی فعلی تێپەڕ بەکار هاتوون، هەر دەڵێی خەریکن دەستووریکی بنجی و زێدە بەرچاوی زمانی کوردی بشێوێنن.

4. حەشارگەی «ناوگر»

وا ڕۆییوە لە نێوان ڕۆشنبیران و زمانەوانان و ڕێزمانشناسانی کورد کەوا ئەوەی پێی دەڵێن «ناوگر Infix» لە زمانی کوردیدا پەیدا نییە، وەک کە «پێشگر و پاشگر Prefix, Suffix» هەیە. دەڵین دیاردەی پێشگر و پاشگر دیاردەی بەرچاو و بێ دەمەتەقەیە لە کوردیدا [منیش لەوەدا لەگەڵیان یەک قسەم] بەڵام دیاردەی هاتنی دەنگێک لەلاوە بۆ ناواخنی وشەی کوردی کەس نەیدیتوە و نەیبیستوە..

ئەوەی ڕاستی بێ، لەم باسەدا نامەوێ بڵێم دڵنیا بووم لە هەبوونی ناوگر لە زمانی کوردی، لێرە بە پێشەوەش هەرگیز نەمگوتوە ناوگر لە کوردیدا هەیە بەڵام بڕیاریشم نەداوە لە دژی هەبوونی: ناوناوە لە نووسینمدا ئیشارەم بۆ هەندێ وشە کردوە کە پێ دەچێ شتێکی وەک ناوگریان تێدا بێت، لەگەڵ ئیشارەتەکەشدا گومانێکم خستۆتە دەوری ناوگربوونی ئەوەی لە ناواخنی وشەکاندا دەدیترێن بەوەدا کە گوتوومە لەوانەیە ناواخنەکە ئاکامی شۆخیکردن بوو بێت وەیا پێداویستیکی فۆنەتیکی هێنابێتیە ناو وشەکەوە.

لەم نووسینەشدا بە جۆرێکی یەکجاری دان بە بوونی ناوگری کوردیدا ناهێنم، بەڵام ئەوەندەی جارانیش دیاردەی بوونی ناوگر لە بەشێکی وشەکانی کوردیدا بەلاوە نانێم چونکە وەک دەردەکەوێت لەم نووسینەدا باسی ناوگر و بوون و نەبوونی ڕێبازێکی ڕوونتری هەیە لەوەی تا ئێستا بە بیراندا هاتوە.

بە دەم سرنج ڕاگرتن لە ئاخاوتنی کوردی و ڕێزمانی کوردییەوە، ڕۆژ لە دوا ڕۆژ تاک تاکە وشەی ئەوتۆم دۆزیوەتەوە کە لە ناوئاخنەکەیدا دەنگێک وەیا زیاتر هەیە گومان لەوەدا نییە کە لەلاوە بۆی هاتوە واتایەکی تازەی پەیدا کردوە وەیا گۆڕینێکی خستۆتە ناو وشەکەوە بەو جۆرەی کە چاوەنۆڕ دەکرێ لە دەوری ناوگر.

ئەم لیستەیەی خوارەوە وشەی ئەوتۆن پێ دەچێ ناوگریان تێدا بێت:

1. ڕەمانە – بە شوێنی گەیشتنەوە یەکتری ڕان و سمت دەڵێن، ڕەنگە لە وشەی «ڕان»ـەوە بە هۆی ناوگر «ەم» پەیدا بووبێت.
2. ئاسەوار – ناوئاخن کراوی «ئاسار»ە بە واتای شوێن و شوێنەوار: «ئاسەواری بڕایەوە»، واتە هیچ شوێنەوارێکی لێ بەجێ نەما، وشە کە لە «اثار»ی عەرەبییەوە هاتوە.[7]
3. شەبەق – بە واتای «شەق بردنێکی گەورە»، پێدەچێ لە وشەی «شەق» وەرگیرابێت.
4. ڕێژەوپێژە – لە ڕژان و پژانەوە هاتوە. دیارە دەنگێکی «ێ» هاتۆتە نێوان یەکەم و دوەم پیتی وشەکانەوە. هەرچەند دەشێ بایەخ بە «ڕێژە» نەدەین چونکی لە هەندێ لەهجەی کوردی لە جیاتی «ڕشتن» «ڕێشتن» دەڵێن بەڵام «پێژە» بایەخی هەیە چونکە نەم بیستوە لە هیچ لەهجەیێکی کوردی لە جێگە «پژان» «پێژان» بەکار بهێنن.
5. ترۆپک – بە تۆپەڵەی سەری شاخ دەڵێن، وا پێ دەچێ لە وشەی «تۆپ»ـەوە هاتبێت. هەندێ لەهجە «تلۆپک»ی پێ دەڵێت.

---

[7] – مامۆستا لە کتێبی «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 200دا دەنووسێت:

*«بەر لە دە ساڵێک لە نووسینێکمدا بۆ ئەوە چووبووم کە وا ڕەنگە «ئاسەوار» هەمان «اثار، ئاسار» ی عەرەبی بێت شێوەگۆڕی تێدا کرابێت. مامۆستا حەسەن قزڵجی لە گوتارێکیدا کە گۆڤاری کۆڕ بە سەرپەرشتیکردنی خۆم بۆی بڵاوکردەوە ڕایگەیاند کە لەوەدا سەهووم کردوە «ئاستەوار» کوردیی ڕەسەنە بە واتای شوێنەواری کۆن هاتوە. ئەوسا ڕاستییەکەم لێ ون بوو، بەو گوتارەی مامۆستا قزڵجی لێم ڕوون بۆوە».* /سایتی مامۆستا.

6. لامێژی - «تێهەڵخستنی بەچکەی ئاژەڵ لەم بزنە، یان مەڕە و لە یەکێکی تر».
7. گوێرەمێژ - «مانگا بەر لە دۆشینی، گوێرەکەکەی تێهەڵدەخەن و خێرا خێرا «کەبوانوو» دەمی پێ لێ دەکاتەوە، ئینجا شیرەکە بە ئاسانی دەداو و ئەیدۆشێ».[8]
8. برێشکە - لە برژانەوە هاتوە. دیارە دەنگێکی «ێ» لەلاوە هاتوە بۆ ناوئاخنی وشەکە. برژ- برێشکە - برێژکە: داخوازی فۆنەتیک دەنگی «ژ»ی گۆڕیوە بە «ش» چونکە پاشگری «کە» دەنگی «ک»ی کپی تێدایە، لە حاڵێکدا دەنگی «ژ» ئاوازەدارە حەز لە «گ» دەکات، بۆیەیە «ژ»ەکە بۆتە «ش» کە ئەویش کپە تاکوو لەگەڵ «ک»دا ڕێک بکەوێت.
9. ناوبرێشک - ڕاستییەکەی «نان برێشک»ـە و گۆڕاوە، ئەویش وەک وشەی «برێشکە» لە برژانەوە هاتوە.
10. ئاراو - بەوەندە ئاوە دەڵێن کە بایی یەک جار شوشتنی جلک بکات. ئەگەر کەرتی پێشەوەی وشەکە «ئار» واتای سەربەخۆ وەیاخود ئەصلێکی سەر بەخۆی نەبێت، وا پێ دەچێ دەنگی «را» لە لاوە بۆ نێو «ئاو» هاتبێت.
11. خارشت - نەخۆشیەکی پێستی ئاژەڵە کە زۆر بە خوروە. دیارە لە «خوران» هاتوە، بە زاهیر دەنگێکی «ا» هاتۆتە نێوان «خ / ر» لە وشەی «خوران».
12. بواردن - لە «بوردن»ـەوە هاتوە. ئەمیشیان دەنگێکی «ا» هاتۆتە نێوان «و، ر» و فعلەکەی کردوە بە تێپەڕ.[9]
13. ژماردن - لە «ژمران»ـەوە هاتوە کە صیغەی ڕوودانی فعلەکەیە و لە ئایندەدا دەبێتە «دەژمرێ» وەک کە «سووتا، برژا، ڕما» لە ئایندەدا دەبنە «دەسووتێ، دەبرژێ، دەڕمێ». ئەم وشەیە تا ئێستاش وشەیێکی زێندوو و بەکارهێنراوە لەناو بەشێکی زۆری عەشیرەتی کورد.
14. شاردنەوە - ئەم فعلەش لە «شرانەوە»وە بە هۆی «ا» بۆتە تێپەڕ و بە ئەسڵ فعلێکی ڕوودانە وەک «ڕازانەوە، نالآنەوە، ناورانەوە...». لە تصریفدا فەرقی نێوانیان وەک تێپەڕ و تێنەپەڕ دەردەکەوێت:
   - شاردمەوە - دەشێرمەوە - دەشارمەوە
   - شرامەوە - دەشرێمەوە
   - ڕازامەوە - دەڕازێمەوە
   - ناورامەوە - دەناورێمەوە

15. سپاردن - ئەصلی ئەم فعلە ئەگەر لێرەدا تۆمار نەکرێت لەوانەیە بە هۆی کەم لەکارهێنانیەوە پاش ماوەیێکی تر تێ بچێت. ئەصڵەکەی لە «سپران»ـەوە هاتوە کە ئەویش فعلی ڕوودانە و ئایندەی دەبێتە «دەسپرێ» وەک کە دەگوترێ «کارەکە بە دارا سپرا - دەسپرێ». من بۆ خۆم لە هاتوچۆی نێوان

---

[8] - ئەم شەرحانە لە لاپەڕە 80 لە زنجیرەی یەکەمی بابەتی فۆلکۆری، ئامادەکردنی ڕەئووف ئالانی و محەمەد عەبدولکەریم بەرزەنجی لەگەڵ دوو وشەی «لامێژی - گوێرەمێژ» بێ دەسکاری وەرگیراون.

[9] - بنواڕە لیستەی فعلەکانی لاپەڕە 123 و شەرحی «بوردن» لە لاپەڕە 124ی کتێبی *«ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لێژنەی زمان و زانستەکانی»*. لەم شەرحەدا هەندێک ڕوونکردنەوەی خۆم لە بارەی فعلی «بووردن» نووسیوە، پێشتر لیژنە بە ئەندامەتی د. نەسرین فەخری و سادق بەهائەدین و نووری عەلی ئەمین «بووردن» یان بە تێنەپەر و «بواردن»یشیان بە تێپەڕەکەی دانابوو.

عەشیرەتانی ڕانیە و پژدەر گوێم لێیان بوە ئەم وشەیەیان وەها بەکار هێناوە. بەو پێیە دەبێ ئەلفێک وەک ناوگر هاتبێت و کردبێتیە «سپاردی».

16. درویّنە - لە «دروون»ـەوە هاتوە: لێرەدا نوونەکەی چاوگ بە بەشێکی وشە حیساب کراوە و دەنگێکی «ێ» کەوتۆتە پێشیەوە هەر خۆشیەتی لە زۆر ناوچەدا پێی دەڵێن «درووونە». ئەم «ێنە»ی کۆتایی وشەکە وەک پاشگرەکانی: «نسکێنە - ماشێنە - شلکێنە، ڕەشکێنە، سپێینە....» نییە کە هاتوونەتە کۆتایی ناوەوە نەک فعلەوە دەشزانین «دروون» سەر بە فعلە نەک ناو.
17. گرنج - لە «گنج»ـەوە هاتوە کە لە واتادا زۆری لێ نزیکە. لێرەدا دەنگی «ر» بە زاهیر بۆتە ناوگر.
18. گرژ وادەزانم لە وشەی «گژ»ەوە هاتبێت وەک کە دەگوترێ «بەگژی دا چۆوە». واتای «گرژی» لە بەگژداچوونەوە زۆر ڕوونە. لێرەشدا ناوگر دەنگی «ر»ە.
19. برنج - دەبێ لێکۆڵینەوەیێکی مێژوویی و بەراوردی تێدا بکرێت بەر لەوەی بڵێین بە هۆی ناوگری «ر»ەوە لە «بنج»ـەوە هاتوە. وەک دەزانین «برنج» ڕوەکێکی زۆر ناودەرکردوە بەوەی کە «بنج» دادەکوتێ.
20. قرژ - وادەزانم لە «قژ»ەوە هاتبێت، چونکە «قرژ» بۆ گیای وشک و دڕک و شتی ئەوتۆی ڕوەک لەگەڵ گەزندەی وەک هۆڵەپەزە و شێرەکولە و... هتاد بەکار دێت «قژ»یش بۆ مووی سەری مرۆڤ. لەمەشدا ناوگری «ر» دەوری دیتوە.
21. کۆمەڵ - دوور نییە لە «کۆڵ»ـەوە هاتبێت،
22. دایەمەمەدۆڕەکێنە - یاریەکە لە کۆیێ پێی دەڵێن «دونگ لەمەڕێ». وشەکە لە «دایە مەمدۆڕێنە» کەوتۆتەوە بە هاتنی دەنگێکی «ک» بۆ ناو پاشگری «اند» کە صیغەی ئایندە و ئەمر و نەهیدا دەبێتە «ێن».

وادەزانم لیستەی وشەکان گەیشتە 22 وشە. هەر وەک بۆ یەکەم سەرنج دەردەکەوێت تارمایی بۆرە دەستوورێک لەو وشانەدا دەدیترێت کە بە هۆی دەنگی «ا» و «ێ» لە فعلەکان و دەنگی «ر» لە ناوەکاندا لە وشەی ترەوە کەوتوونەتەوە. من تا ئێستا کە حەزم نەکردوە بڵێم ناوگر هەیە لە کوردیدا بە هۆی ئەوەوە بوە چ دەستوورێکی بەرچاوم نەهاتۆتە بەر هەست ڕچە و ڕێچکۆڵەیێک ڕەنگرێژ بکات بۆ هەڵقوتانی ناوگر لە وشەدا، بەڵام بە تێپەڕینی کات و بەرفرەوانکردنی مەیدانی بەدواداگەڕان دروشمێکی دەستووری هاتنە ناوی ناوگری کوردیم بۆ ڕوون بۆتەوە بایی ئەوەی ترس و دوودڵی بێدەستووریم لە باسەکە بشکێنێت. لەگەڵ ئەمەشدا، دیاردەی ڕێزمانی کە سەری ڕێی بە هۆشی مرۆڤ گرت نابێ دان هێنان بەو دیاردەیە لەسەر بوونی دەستوور پەکی بکەوێت وەک ئەوەی بەشێکی فعلەکانی کوردی بە شێوەی ڕیزپەڕ (شاذ) و بێدەستوور لە ڕابردووەوە بۆ ئایندە گەردان دەکرێن کەسیش نەی گوتوە ئەم فعلانە فعل نین یاخود ڕابردوو و ئایندە نین چونکە دەستووریان نییە.

من لەم نووسینەدا باسی ناوگری کوردی وەک حەشارگەیێکی ڕێزمان دەخەمە بەر چاوی زمانشناسانی کوردەوە بۆ ئەوەی لێی ورد ببنەوە و بەدوای ڕاستی پرسیارەکەدا بگەڕێن بەڵکوو بە لایێکیدا دەیەخن: چ بوون بێ چ نەبوون. دەبێ ئەوەش بە چاوی خۆمانەوە بگرین کە «ناوگر» شتێک نییە وەک دێوی سپی و ئینسانخۆر کە سڵی لێ بکەینەوە وەیا دوعای «قنوت»ی لێ بخوێنین، هەبوونیشی لە کوردی چ حیسابان سەرەوەبن ناکات، بگرە نەبوونی جێی سەیر هاتنەوەیە. ئەو نووسەرانە و زمانشناسانەش کە لێرە بە پێشەوە گوتویانە ناوگر لە

کوردی پەیدا نییە لێیان شیرن دێت دان بە ڕاستی پرسیارەکەدا بهێنن ئەگەر بۆیان ڕوون بۆوە ناوگر هەیە بە پێچەوانەی بۆچوونی خۆیان. مامۆستایانی کۆلێج و قوتابخانەکانمان دەتوانن بە چاوسوورکردنەوە لە قوتابییەکانیان دەمکوتیان بکەن و دەنگی ڕەخنە و نەسلماندنیان کپ بکەن، بەڵام بێگومان دوای دەرچوونی قوتابییەکان و بەسەرچوونی ترسی کەوتن لە «ئیمتحان» چاوسوورکردنەوە بە نیسبەت ئەو دەرچوانەوەوە دەپووچێتەوە و دەبێتە هۆی تیژتربوونیان لە تۆڵە سەندنەوەی سەردەمی نەفەسبڕینیان.

لە کۆن و نوێ، لێرە و لە شوێنانی تر ئەو تەرزە مامۆستایانە هەبوون و هەن. ئەوان کەسانە خۆشیان و ئێمەش دەزانین هەڕەشەکردن لە بێدەسەڵات کارێکی ناجایەزە، ئاکامەکەشی کە زیندەبەگۆڕکردنی مەبدەئی ئازادیی بیر و باوەڕ و سەرپۆشکردنی ڕاستییە زەرەرێکە لە خۆمانی دەدەین. لەبەر ئەمە من لە ئێستاوە ئەو تەرزە هەڵوەستە تاوانبار دەکەم هەروەک هەمیشە تاوانبار کراوە و دەبێ بشکرێت. بەڵگەی بەرپەرچدانەوەی بیروباوەڕ دەبێ لە هۆش و ژیربێژی و واقع و ڕاستییەوە هەڵێنجرێت نەک هەڕەشەکردن لە بێدەسەڵات. دەبێ ئەوەش بڵێم، باسی ناوگر وەکوو هەموو باسێکی تری ڕێزمانی کوردی لە شێوەی ئاخاوتنی ئێستاکەمانەوە سەر هەڵدەدات نەک لە بنج و بناوان و سەرچاوەی ئاخاوتنی چەند سەد و چەند هەزارساڵی لەمەو پێش.

گریمان بە تۆژینەوەیێکی مێژوویی ورد و قووڵ بۆمان ڕوون بۆوە فلانە پاشگر و پێشگر و ناوگر لە کۆندا نەبوون وەیا جۆرێکی تر بوون ئێمە هەر دەبێ وەک ئێستاکەیان سەیر بکەین و بیان نرخێنین. کە لێمان مەعلوم بوو لە وشەی «بواردن» و وشەی وەک ئەودا دەنگی «ا» ناوگرە چ لزووم نامێنێ بۆ بنەبڕکردنی پرسیارەکە بزاندرێ لە کۆندا هەبوە؟ نەبوە؟ کەی هاتوە؟ چۆن بوە؟ چۆن گۆڕاوە؟ هەر وەک لە کەس داوا ناکرێ بۆ ئیسپاتکردنی پێشگربوونی «هەڵ، دەر، تێ، ڕا..» بە مێژوودا بچێتەوە و بزانێ پێش هەزار ساڵ و دوو هەزار ساڵ ئەمانە چۆن بوون و چۆن نەبوون. تۆژینەوەی مێژوویی کارێکی سەربەخۆیە و مەیدانی تری هەیە.

گریمان ئەم دەرگاکردنەوەیەی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە بەڕووی ڕۆشنبیرانی کورددا هیچیشی لێ شین نەبۆوە و سەری بە هیچ ئاکامێکی بەرهەمدار نەگەیاند، ئەوەندەی بەسە ببێتە هۆی چاو پێدا گێڕانەوە بە بەشێک لە قەناعەتە ڕەگ داکوتاوەکانی ڕێزمانی کوردی کە بە دەست ئەزموون و تاقیکردنەوەوە شلکە دەکات.

«...»

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوانەدا بە دەرفەت دەزانم خزمەتێکی تێکڕای ئەو ڕێزمانشناسانە بکەم کە وا دەزانن ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک لە کۆتایی فعلی ئایندەدا دەردەکەوێتەوە هەرچەند دان بەوەدا دێنن کە لە کۆتایی ڕابردووی تێنەپەڕدا ئەو ڕاناوە دەرناکەوێت.

ڕێزمانشناسەکان لە جیاتی ئەوەی بڵێن ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک کە لە ڕابردووی تێپەڕدا دەردەکەوێت، بە هۆی یەکگرتنەوەی قەوارەکەی تێپەڕ لەگەل قەوارەکەی تێنەپەڕ لە ئایندەدا ئەویش بزر دەبێت، لە جیاتی ئەمە دێن دەڵێن ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک کە لە ڕابردووی تێنەپەڕ دەرناکەوێت بە هۆی ئەوەی لە قەوارەی ئایندەدا لەگەڵ تێپەڕ یەکتر دەگرنەوە ڕاناوە تێنەپەڕەکە دەردەکەوێتەوە، واتە لە تێکبەستنی مردوو و زیندوو مردوەکە دەژێتەوە نەک زیندوەکە دەمرێ.

من لە زۆر جێگەدا گوتوومە و نووسیومە، کەسی سێیەمی تاک لە صیغەی ئایندە دەرناکەوێت و ئەوەی دەبێتە کۆتایی فعلەکە لەو صیغەیەدا شێوەی تصریفییە نەک ڕاناو. لە فعلەکانی:

- دەچێت - دەخوات - دەژێت
- دەچێتن - دەخواتن - دەژێتن

دەنگەکانی «ێت - ێتن / ات - اتن / ێت، تێن» هیچیان نە بەتەنهایی و نە بە تێکڕایی ڕاناو نین بەڵکوو شێوەی تصریفین.

لێرە بە پێشەوە، لە نووسینی دیکەمدا، بەڵگەی ڕاناو نەبوونی ئەو دەنگانەم باس کردوە، بەڵام لێرەدا ئەمجارەیان چەند بەڵگەیێکی دیکە دەهێنمەوە کە بەلای باوەڕی خۆمەوە هیچ گومانێک ناهێڵێ بە دەوری ڕاناو نەبوونی ئەو دەنگانەوە، واشدەزانم کەسێک مەبەستی دۆزینەوەی ڕاستی بێ یا دەبێ بەڵگەکان بسەلمێنێ و واز لە ڕاناوبوونی ئەو کۆتاییانە بهێنێت، یاخود لە سەریەتی بەڵگەی نوێی پێچەوانەی بەڵگەکانی من پەیدا بکات کە زانستی ڕێزمان پێیان ڕازی بێت نەک مەیلی پێداگرتن لە سەر باوەڕی کۆن خۆی پێ هەڵفریوێنێ.

بەر لەوەی بەڵگەکان بهێنمەوە وا بە چاک دەزانم وەرامی یەکێک لە بەهانەکانی بە ڕاناو حیسابکردنی ئەو کۆتاییانە بدەمەوە کە لە مەوبەر نەمهێناوەتە ناو نووسینی لێرە بە پێشەوەم.

زمانشناس هەیە دەڵێ بەڵگەی ڕاناوبوونی دەنگی «ت» لە کۆتایی فعلەکانی «دەڕاوت - دەچێت - دەژێت» و هەموو فعلێکی تری وەک ئەوان کە بۆ کەسی سێیەمی تاکن، لەوەدایە کە وا بە ناچاری ئەو دەنگە لە کاتی بەکارهێنانی پاشگری «ەوە» بەدیار دەکەوێتەوە. واتە هەرچەند مومکینە بگوترێ:

- دەڕوا - دەڕواتن
- دەچێ - دەچێتن
- دەژێ - دەژێتن

بەڵام کە ویستمان پاشگری «ەوە» یان بەدوادا بهێنین دەبێ دەنگەکەی «ت» زیندوو بکەینەوە و بڵێین «دەڕواتەوە، دەچێتەوە، دەژیتەوە» گۆیا بەمەدا ئیسپات دەبێ کە دەنگەکەی «ت» ڕاناوە نەک «تن»...

ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی ڕواڵەتپەرەستییە چ پێوەندی بە قووڵایی زمان و ڕێزمان و دەستووراتی ئاخاوتن و حوکمە ورد و نهێنیەکانیانەوە نییە. ئەو کەسەی خەیاڵی بۆ دیاردەی هاتنەوەی ئەم «ت»ـە چوە دەبوو لەگەڵ ئەودا خەیاڵی بۆ کەسی دوەمی تاکیش چووبایە لە فعلەکانی وەک: «دەخۆیت، دەکەیت، دەچیت» کە لەواندا

بەشی زۆری کورد دەڵێن «دەخۆیەوە، دەکەیەوە، دەچیەوە، دەنوویەوە....» چونکە لەمەدا بۆمان معلووم دەبێ بە نیسبەت ڕاناوی کەسی دوەمەوە جگە لە دەنگی «ت» کە لە کۆتایی ڕاناوەکە هەیە دەنگێکی تری «ی»ش هەیە ئەم پاشگرەی «ەوە» خۆی پێوە بگرێت بۆیە بوو توانرا دەنگەکەی «ت» لە فعلەکانی «دەکەیت، دەڕۆیت...» بسوێت و ڕاناوە ڕاستەکییەکەی «ی» بمێنێتەوە کە دەزانین ئەم «ی»ـە هەرگیز سوانی بۆ نییە، واتە وەک دەنگەکەی «ت» نییە بسوێت و نەسوێت.

لە حاڵەتی فعلی ئایندەی کەسی سێیەمی تاکدا چ ڕاناوی وەک «یت» وجودی نییە تاکوو بتوانین لەوێشدا دەنگە سواوەکان بە سواوی بهێڵینەوە و پاشگرەکە بەو بەشەی ڕاناوەکان بلکێنین کەوا وەک «ی»ـەکەی کەسی دوەم ماوەتەوە و سوانی بە سەردا نەهاتوە. لە فعلی «دەڕوێت - دەڕۆی» ڕاناوەکە دەنگی «ی»ـە و دەتوانی بڵێی «دەڕۆیەوە» دەشتوانی دەنگەکەی «ت» کە زیادەیەکی تصریفییە بهێنیتەوە و بڵێی «دەڕۆیتەوە» بەڵام لە فعلی «دەڕوا» نە ڕاناو هەیە و نە دەنگێکی کۆنسنانت هەیە پاشگری «ەوە» خۆی پێوە بگرێتەوە بۆیەیە دەبێ دەنگێکی کۆنسنانت بێ و ببێتە ئاڵقەی پێوەندی.

هاتنەوەی دەنگی «ت» بۆ پێشایی «ەوە» سیفەتێکی تازە بەو «ت»ـە نابەخشێت و نایکاتە ڕاناو. بەر لە قرتان و سوانی چی بووبیت بە هەمان سیفەتەوە دەگەڕێتە، واتە ئەگەر شێوە و زیادی تصریفی بێت هەروەها دێتەوە، کاتێک پێی دەڵێین ئەم دەنگە بە ڕاناوی دێتەوە بۆ دوای پاشگری «ەوە» کە ئیسپاتمان کردبێت لە بنەڕەتدا ڕاناو بوە. نەهاتنەوەی «تن»یش هەر ئەوەندە دەلالەتەی هەیە کە دەنگەکەی «ت» بە ئەسڵ نزیکترە لە کۆتایی فعلەکان بۆیەیە «ت»ـەکە بە جۆرێکی عفوی لە شێوەی بەدیهیدا هاتۆتەوە: من کە بتوانم لە فعلەکاندا بڵێم «دەڕوات، دەچێت - دەڕواتن، دەچێتن» بۆچی دەبێ ناچاربم سەرلەبەری «تن» بهێنمەوە لە حاڵێکدا من بەرلەوەی پاشگری «ەوە» بەکار بهێنم ڕێم هەبوو ئەو دەنگەی «ن» بسوێنم و اکتفا بە «ت» بکەم. خۆ ئەگەر دوو دەنگی «تن» وەیا تەنها دەنگی «ن» لەگەڵ پاشگری «ەوە»دا هاتبایەوە ئەوساش چ بەڵگەیێک لەوەدا پەیدا نەدەبوو کە ئەمانە «ڕاناون»، دەبوو زووتر ڕاناوبوونیان بە ئیسپات گەیشتبێت تاکوو بڵێین لە هاتنەوەیان بەدوا «ەوە» شدا هەر ڕاناون. لە زۆر جێگەی کوردستاندا ئەم پاشگرەی «ەوە» کە بە دوا فعلی ئەلفیدا دێت دەنگێکی «ی» ناوەندی دەهێنن بۆ ئەوەی پاشگرەکە خۆی پێوە بگرێت کەسیش نەیگوتوە ئەم دەنگە ناوەندییە ڕاناوە وەیا بەشێکە لە بەشەکانی تری ئاخاوتن. بە نموونە سەیری ئەم ڕستانە بکە:

- هەڵستا - هەڵستایەوە
- گەڕا - گەڕایەوە

گەرمی و تەڕیی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە
پشکۆی گوڵ ئاتەشین بە نەسیم بوو گەشایەوە

ئەوجار دێمە سەر پێشکەشکردنی ئەو بەڵگانەی کە ڕاناو نەبوونی کۆتاییەکانی صیغەی فعلی ئایندە (مضارع) بۆ کەسی سێیەمی تاک وەک «دەچێت، دەبێت، دەخوات، دەژێت» بە ئیسپات دەگەیەنێت. لێرەدا دوو بەڵگەی تا بڵێی بەهێز و خیلافبڕ بە تازەیی دەیەخمە سەر سفرەی لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی کوردی. باوەڕ دەکەم وردبوونەوەی بەردەوام و سەرنج ڕاگرتنی ورد و قووڵ بەڵگەی دیکەی وەک ئەمانە پەیدا دەکەن چونکە، بەلای منەوە، هەموو ڕاستیەک چ لە زمان و چ لە غەیری زمان لە گەلێک سەرەوە بەڕاست دەگەڕێت.

بەڵگەی یەکەم

فعلێکی ئاینده دەهێنین و تصریفی دەکەین، لەو تصریفەشدا ڕاناوەکان جودا دەکەینەوە یاخود بابڵێین دەست نیشانیان دەکەین:

- دەڕۆم - «م»
- دەڕۆین - «ین»
- دەڕۆیت - «یت»
- دەڕوات - «ات» یاخود «ت» بە پێی ڕای ئەو زمانشناسانە
- دەڕۆن - «ن» بۆ «ئێوە» و «ئەوان»

ئێستا ئەم ڕاناوانە - ئەگەر ڕاناو بن - دەخەینە ڕستەی ئەوتۆوە تێیدا ببن بە مفعول:

- دەیانبردم - «م»
- دەیانبردین - «ین»
- دەیانبرد - «-»
- دەیانبردن - «ن»

وا ڕاستییەکە لە چاوان دەچەقێت: ئەگەر «ات» وەیا «ت» کە لە کۆتایی فعلی ئایندەی کەسی سێیەمی تاکدا دێت ڕاناو با، دەبوو ئەویش وەک ئەوانی تر دەرکەوتبایە و ببووبایە مفعول. ئەگەر ئەمە وەها با دەمانگوت «دەیانبردت - وەیاخود دەیانبردات وەیا دەیانبردێت وەیا دەیانبردیت» - بە پێی کۆتایی فعلەکانی ئایندەی کەسی سێیەمی تاک.

من دەزانم ئەم بەڵگەیە بەسە بۆ ڕەواندنەوە و یەکلاکردنی گرفتەکە چونکە زۆر لە باسی ڕێزمانی و هی تریش بە بەڵگەی لەمە بێهێزتر یەکلا کراوە، لەگەڵ ئەمەشدا بەتەما نیم ئەم بەڵگەیە نەسەلمێنان ئیقناع بکات چونکە نە بەڵگەکە وەک بەرد و ئاسن و دار بەدەست دەگیرێت نە عینادیش کارێکی گرانە بەتایبەتی کە مرۆڤ لە ماددەی عینادیکردن پیربووبێت و پێوەی ناسرا بێت.

یەکێک کە بە هەموو عومری نووسین و ڕێزمانشناسی خۆی هەر گوتبێتی دەنگە «ت»ـەکەی کۆتایی فعلی «دەڕوات و دەچێت و دەژێت» ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە، وەها بە ئاسانی نایەت بڵێ بەڕاست خۆ ئەم دەنگە وەک ڕاناوەکانی تر لە ڕستەدا دەرنەکەوت کەواتە دەبێ ڕاناو نەبێت.. لە جیاتی ئەم سەلماندنە بۆرە تەئویلێک و وەرامێک دەسازێنێت، وەک ئەو بەردەبازەی بەسەریدا لە ڕووباران دەپەڕنەوە، ئەویش بەسەر تەئویل و وەرامی سازاودا باز دەهاوێت بۆ ئەوبەری ڕووباری سەلماندنی زۆر تاڵ و تفت. بەڵام ئایا بەڵگەی دووەمیش لەوانەیە بە تەئویل و وەرامی دەسکرد بەردەبازی لێ پەڕینەوەی تێدا بسازێت؟ وادەزانم ئەم بەڵگەیەیان خۆ لێ بە سەهۆ بردنی ئاسان نەبێت، فەرموو لەگەڵ مندا بە چاوێکی کرایەوە و هۆشێکی هەستیار سەیری بکە.

بەڵگەی دووەم

دەزانین بە لای ئەو ڕێزمانشناسانەوە کۆتایی فعلەکانی «دەبێت، چووبێت، بووبێت.» هەموویان ڕاناون، تەنانەت بە ڕاشکاوی دەتوانرێ بگوترێ «دەبێ، دەبێتن - چووبێ، چووبێتن - بووبێ، بووبێتن..» وەک کە دەگوترێ «دەڕوات، دەڕواتن - دەچێت، دەچێتن..».

زۆر بە جێیە. - بەڵام من لە پاش ئەم «بەجێبوون»ـە و حیسابدروستییەدا پرسیارێکم هەیە: ئەگەر «ت»ـەکەی دوای «بووبیت، چووبێت..» ڕاناو بێت ئەدی «بووبێتم، چووبێتم، بووبێتین، بووبێتن.....» چ لێ بکەین؟

بە ڕاناوەکانی «م، ین، ن..» بڵێین چی؟ ئایا دەشێ بگوترێ لە یەک فعلدا دوو ڕاناو فاعل بن یەکیان بۆ کەسی سێیەمی تاک و ئەوی تریشیان بۆ کەسانی تر؟

ئەمە لە فعلی تێنەپەڕ؛ لە فعلی تێپەڕ گرفتێکی گەورەتر پەیدا دەبێت: لە فعلی تێنەپەڕ دەڵێی «نوستبێت» بەڵام لە فعلی تێپەڕ دەڵێی «کردبێتی، خواردبێتی، دیتبێتی»، کە لە کۆتایی فعلەکاندا دەنگی «ی» هەیە و دەزانین ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک وەک کە «کردبێتمان، کردبێتتان، کردبێتت، کردبێتیان» هەموویان ڕاناوی فعلی تێپەڕیان هەیە. بەو پێیە دەبێ بڵێین «کردبێتی، خواردبێتی، دیتبێتی..» و هەموو فعلێکی وەک ئەوان دوو ڕاناویان تێدایە بۆ کەسی سێیەمی تاک.

وەک دەبینی ئەم گرفتە لەوانە نییە بە ماست تێهەڵسوون و پینەکردن و چاو لێ هەڵەنگاوتن بڕەوێتەوە، بایەخ پێ نەدانیشی ڕاستەوخۆ دەبێتە هەڵاتن.

ئەو ڕێزمانشناسانەی دەڵێن لە ڕستەی وەک «من ئازام» دا فعل هەیە بەڵام قرتاوە و ناشزانین ئەسڵەکەی چی بوە وەتەنگتر دێن لە ئاست ئەم «نووسیبێتم، دیتبێتمان، کردبێتی..» چونکە لێرەدا دەبێ بڵێن ڕاناوێک لە ئاسمانەوە بەربۆتەوە و پەڕیوەتە ناو فعلەکان.

«...»

لەم نووسینەدا بۆ مەبەسی تێگەییشتنی زۆرینەی خوێندەواری کورد و کوردیی زاراوەی زۆر بیستراو و بەکارهاتووی وەک «فعل، صیغة، مبني للمعلوم و للمجهول» و شتی تریش بەکار هاتوە. گەلێک لەو زاراوە عەرەبییانە لە کوردیدا پتر لە وشەیێکیان بۆ داندراوە لە لایەن زمانشناسەکانی کوردەوە: بۆ فعل زاراوەکانی «کردەوە، کردار، کار، فرمان» بە نووسیناندا بڵاو بۆتەوە، ڕەنگە هەموو خوێنەرێک لە هەموو زاراوەکان شارەزا نەبێت بەڵام هەموویان بزانن «فعل» چیە کە هەر خۆی سەرچاوەی زاراوە کوردییەکانە. وشەی «گەردان»ی کوردی بە واتای «تصریف» وەیا وشەی «ڕێژە» بە واتای «صیغة» زۆر ئاشنا نەبۆتن بە لای گەلێک لە خوێندەوارانەوە بە تایبەتی ئەوانەی لە عومردا نەختێک تێ هەڵکشیون. لەبەر ئەمە ویستوومە لەم نووسینەمدا بە هۆی بەکارهێنانی زاراوەی ناودەرکردووی عەرەبییەوە نەختێک لە تازەیی و زەحمەتی باسەکان کەم بکەمەوە.

ناوی ئەو سەرچاوانەشم نەهێناوە کە نووسینەکەی من لە گەڵیاندا ڕێک ناکەوێت وەیا لە بنەڕەتدا پێیان ڕازی نییە. ناو هێنانی نووسینەکانی مامۆستا وەهبی و د. نەقشبەندیش لەبەر تاکە مەبەستی «حەشارگە»بوونی باسەکانی خۆم بوە نەک بە نیازی ڕووبەڕووبوونی بیروڕای ئەو نووسینانە. دەتوانم بڵێم زۆربەی نووسینی کوردی لەسەر ڕێزمان و سەر بە ڕێزمان لەوانەیە بە عەلاقەدار لەگەڵ ئەم نووسینە لە قەڵەم بدرێن و لە پەڕاوێزاندا دەیان جار ناویان بێت بە نیازی پێ ڕازی نەبوونیان.

من ناوناوە بە گوتار هەندێ باسی ڕێزمانی کوردیم داوەتە بەر لێکۆڵینەوەی ورد و درێژەپێدراوەوە کەوا گەلێک لە نووسینی عادەتی سەر بە ڕێزمانی کوردی کە تا ئێستا ڕێزمانشناسان بڵاویان کردۆتەوە، نەفەسدرێژتر و هەڵسەنگێنتر و تێهەڵکشیوتر و بەربڵاوتر و وردتر و قووڵتر بوە وەک ئەوەی کە لە گوتاری *«سووڕێکی خامە بەدەوری ڕاناودا»* بەشێکی باسی «ڕاناو»م لە 120 لاپەڕەدا نووسی. هەرچەند دەزانم نووسەرانی کورد و خوێنەرانیشی، ئەم درێژە پێدانە بە زیاد لە قەڵەم دەدەن، ڕەنگە لێشی وەتەنگ بێن، بگرە نەشی خوێننەوە، لەگەڵ ئەمەشدا وەک من لە گۆشەی هەڵوەست و هەست پێکردنی خۆمەوە بۆ پرسیارەکانی ڕۆشنبیری کورد، بە تێکڕایی، دەچم لە ڕەچاوکردنی دوو ڕاستی زۆر گرنگەوە هەڵوێستی خۆم لەتەک هەڵوێستی نووسەران و خوێنەراندا پەسەندتر دەکەم:

ڕاستی یەکەم ئەوەیە، ناقۆڵا هاتنە بەرچاوی نووسینی نەفەسدرێژ لە کوردیدا سووچی نووسینەکە نییە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ ڕانەهاتنی کورد لە خوێندنەوەی نووسینی درێژەپێدراو لە زمانی کوردیدا: ئێمە هەر وامان دیتوە نووسەری کورد بە چەند دێرێک لەو مەبەستەی بوەتەوە کە ئەگەر لە زمانێکی پێشکەوتووی ئەم جیهانەدا مەبەستێکی ئەوتۆیی باسی لێ بکرێت چەندین لاپەڕە دەخایەنێ، ئەگەر نەڵێم نامێلکە... هەندێ کتێبی کوردی لێرە بە پێشەوە کە قەوارەی گەورەی هەبوە، بە هۆی نەفەسدرێژیی نووسینەکەی ناویەوە نەبوە بەڵکوو لەبەر زۆربوونی ئەو باسانە بوە کە لە کتێبەکەدا قەتاریان بەستوە و هەر یەکێکیشیان کتێبێکی سەربەخۆی ویستوە.

یەکێک ڕێی هەبێ بەدوا شتاندا بگەڕێ دەتوانێ بەقەدەر بەشێکی بەرچاوی نووسین لە سەر باسەکانی ڕێزمانی کوردینووسین و دەمەتەقە و لێکۆڵینەوە بدۆزێتەوە لە عەرەبیدا لەسەر تەنها باسی «کل، بعض» و چۆنیەتی لەکار هێنانیان و قبووڵکردن و نەکردنی «الف لام التعریف» و هۆی ئەو حوکم و حاڵانە... بەڕاستی هەژارییە میراتییەکەمان وای لێکردووین هەموو نیشانەیێکی «ناهەژاری» و تێری و تەسەلی لە خۆمان بە زیاد بزانین، ئەگەر نەڵێم لە خۆمانی بە عەیب بگرین، وەک ئەو ڕووتەڵەیەی کە کڵاوێکی نوێی لەسەرنا وەیا پێڵاوە شڕەکەی بۆیاغ کرد تا ماوەیێک وشت و قوتاغ دەبێ و سەیری لەخۆی دێتەوە..

ڕاستی دوەم ئەوەیە کە هەمان خوێنەری کورد کە وەتەنگ دێت لە نووسینی درێژەداری کوردی و درێژیەکە بە عەیب دەگرێ لە نووسینەکە، نە وەتەنگ دێت و نە چ عەیبانیش دەگرێت لە نووسینی درێژەپێدراو و

بێبڕانەوەی زمانێکی تر لەو زمانانەی کە ناویان دەرکردوە بە پێشکەوتوویی و دەوڵەمەندی. لەمەشدا سەرلەنوێ، ئێمەی هەژار، سەیری خۆمان و میللەتانی تر دەکەین بە چاوی ئە و ڕووتەڵەیەی کڵاوی نوێی خۆی لێ دەبێتە عاجباتی بەڵام بیست گەز پشتێنی هیزار بە کەمەری دەوڵەمەندێکەوە بە کەم دەزانێ.

من بەو دوو ڕاستییە خۆم دابین دەکەم لە وەرامدانەوەی ئەو کەسەی درێژەپێدان لە نووسینی کوردی دەکاتە عەیب لە حاڵێکدا هەمان درێژەی نووسین لە زمانێکی تردا بە کارێکی ڕەوا دەزانێت، لەوە بەولاوە کە بێم سەیری دەستبەتاڵیمان بکەم لە لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە و کێشانە و پێوانەی هەموو ئەو بابەتانەی کە پێوەندییان بە کورد و کوردستان و کوردییەوە هەیە یەکسەر، بێ تێخوێندنەوەی بەراوردکردن لە نێوان کوردیی هەژار و زمانە دەوڵەمەندەکاندا، دەستەویەخەی نووسەری کورد دەبم و داوای نووسینی پتر و درێژتر و پانتر و قووڵتر و وردتری لێ دەکەم و لەو شتانەی دەربارەی «کوردناسی»یەوە دەیاننووسێت چونکە ئێمەی کورد بە خۆمان و ڕابردوومان و وڵاتمان و زمانمان و کۆمەڵایەتیمان و ئێستامان و دواڕۆژمانەوە لە ناخی تاریکاییدا ڕۆچووین و چ ڕووناکایی ئەوتۆ شک نابەین خۆمانی پێ بناسینەوە. لە حاڵەتێکدا گڵۆپی هەزار مۆمی بەشی ڕوونکردنەوەی گۆشەیێکی تاریکی بوونمان نەکات، چۆن دەبێ وەتەنگ بێین لە چراقۆدیلە و فانۆس!!

میللەتی ئینگلیز دەزانێ زمانەکەی ئێستای موتوربەی چەند قەڵەمە و چ گۆڕان و بەرەوەپێش چوونێکی بەسەردا هاتوە، لەم زانینەشدا مێژووی وشەکان و ئەداتەکان و گەردانەکان و تێکبەستەکان و هەموو سەروبەرێکی ئاخاوتنەکەی خۆی دەزانێت، تەنانەت بەلایەوە ڕوونە ئەوەی لە ڕێزماندا پێی دەڵێن «s» Apostrophe لە کوێوە هاتوە.

ئایا ئێمە هیچمان زانیوە لە بارەی زیادیەکانی فعل ئەمر و هەندێ فعلی تری سلێمانی وەک «بلێرەوە، بچۆڕەوە - دەچێتەوەوانێ، گەیشتەوەوانی..» وەیا ڕاستی و هەڵەیی گۆڕانی «لامی قەڵەو» بە «ڕێی ناسک» لە شێوەی ئاخاوتنی کۆیێ و بەشێکی زۆری سۆران، وەیا سەرچاوەی گۆڕانی ڕاناوی لکاوی «مان، تان» بە «ن، و» لە پژدەردا وەیا هۆی نەهاتنی ڕاناوی لکاوی ڕابردووی تێپەڕ لە شێوە ئاخاوتنی کرمانجی سەروودا وەیا هاتنەوەی دەنگی «ا»ی فعلی ڕوودان بە دوا ئەو فعلانەی کە کۆتاییان بە «ی» دێت لە گەرمێندا وەک کە دەڵێن «ڕزیا، خشیا.... لە جیاتی ڕزی، خشی» وەیا و هەزاران وەیای تر؟

ئێمە لە بێدەسەڵاتیی خۆمانەوە ڕاهاتووین بەوەی ئەم دیاردە ڕێزمانیانە بە «امر واقع»ی بێنیاز لە تەفسیر وەرگرین، کەچی نازانین ئەگەر بەم «خۆ ڕازیکردن»ـە ڕازی بین پێی ناوی لە سەرەتاوە خەریکی ڕێزمان بین دۆزینەوەی دەستوورەکانی ڕێزمان بۆ ڕوونکردنەوەی تاریکایی مەفهووم نەبوونی «چۆنیەتی»ی ئاخاوتنە، ئەم دیاردانەش بەشێکن لەو چۆنیەتیە نامەفهوومە.

دەزانم و ئاگادارم لەوە کە ئەگەر بێین و شیکردنەوەی سەرلەبەری ڕێزمانی کوردی بدەینە بەر درێژەپێدان و وردپێوییەوە کاتێکی زۆر و هەوڵێکی بێوچان و دەرفەتێکی بەرفرەوان و خۆتەرخانکردنێکی سەرلەبەرمان پێ دەوێت بەو شکڵەی کەوا ڕەنگە لە دەسەڵاتماندا نەبێت. لەبەر ئەمە قسەکانی من لەم دێڕانەی دواییدا نەیویستوە ئەو هەوڵە کەمتاکورتەی لە بارەی ڕێزمانەوە [وەیا هەر باسێکی ترەوە] دراوە عەیبدار بکات، بە پێچەوانە من هەمیشە خۆشامەدیم کردوە لە هەموو نووسینێکی کوردی، ئەوەندەی توانیبێتیشم ویستوومە یارمەتی بڵاو بوونەوەیان بدرێت. ئەوەی دەمەوێ لێرەدا دەری بڕم گلەییکردنێکە لەو نووسەرانە و خوێنەرانەی وەتەنگ دێن لە نووسینی کوردیی درێژەدار و قووڵهەڵێنج لە حاڵێکدا ئەگەر بە نووسینی بیندرێژ و ورد و قووڵ بێسەروشوونیی باسەکانی «کوردەواری» تێ نەهێنینەوە هەر لە تاریکیستانی ئێستاکەماندا دەمێنینەوە بەرانبەر چەشمەندازی «کورد و کوردستان» بە هەموو بوعدەکانی ستوونی و ئاسۆییەوە.

تێبینی زەحمەتی لە ڕادەبەدەری وردپێوی و قووڵداگرتن لە سەرجوملەی ڕێزمانی کوردی خستمیە سەر پێڕەویکردنی دوو ڕێبازی لە یەکتر جودا لە لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی کوردی: ڕێبازێکیان ئەوەیە کە لێژنەی «زمان و زانستەکانی» تێیرا دەڕوات بەرەو ئامادەکردنی کتێبێکی مام ناوەنجی لە تێکڕای باسەکان و دەستوورەکانی ڕێزمانی کوردی.[10] واشدەزانم خەریکبوونی ئەم لێژنەیە، بەهەمەحاڵ، لەو خەریکبوونانەی تا ئێستا کراون، بەرهەمدارتر بێت.

ڕێبازی دوەمیان ئەوەیە کە لە نووسینی سەربەخۆی خۆمدا ناوناوە بە گوتار وەیا لە شکڵی نامیلکەدا لێکۆڵینەوەی دریژەدارتر دەگرمە بەر.

ئەم ڕێبازەیان دەست نادا بۆ ئەوەی گەشتی سەرلەبەری ڕێزمانی تێدا بکرێ چونکە گەشتی وەها بەردەوام لە هەموو ڕێزماندا سەرەتای دەبێ بەڵام لە ژیانی تاکە کەسدا کۆتایی نایەت. لەبەر ئەمە ناچارم سەرەباسی تایبەتی دەهێنم و بە پێی توانا، لێی دەکۆڵمەوە هەروەک لە گوتارەکانی:

1- بەکارهێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردیدا
2- سوورێکی خامە بە دەوری ڕاناودا
3- فۆنەتێک چیمان بۆ بکات؟

و ئەو بەسەرداچوونەوانەی کە لە کاتی نرخاندنی گوتاران وەیا ڕەخنە لێ گرتنیان لێم بوون بە کاری ناچاری. لێکۆڵینەوەی بیندرێژم کردوە. نووسینی ئەمجارەشم یەکێکە لە ڕیزە ئاڵقەی ئەو لێکۆڵینەوانەی تاک تاکە باسی ڕێزمانی دەدەنە بەر پێوانە و کێشانەی بە پێز و پیت، هەر بۆیەیشە باسی ئەوتۆم هەڵبژاردوە کە نابەرچاون لە ڕێزمان و دەستووراتی ئاخاوتنی کوردی، لە زمانی بێگانەشدا وێنەیان پەیدا نابێ چونکە هەموویان تایبەتی ئاخاوتنی کوردین.

بێگومان نووسەری تری کوردیش هەن ئەم کارە درێژەپێدراوەیان لە هەندێک سەرەباسی ڕێزماندا کردوە بە جۆرێک کە لە تێکڕای چالاکیەکانیاندا ئەو تەرزە بیندرێژیەیان بەکار نەهێناوە. بە نموونە لە هەمان بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا کە گوتارە نەفەسدرێژەکەی خۆم «بەکار هێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردیدا»ی تێدا بوو گوتارێکی مامۆستا تەوفیق وەهبی لە سەر «ئە»ی پێش کاری ئایندەی ناوچەی سلێمانی و گوتارەکەی د. عەبدوڵڵا نەقشبەندی لە بارەی «پاشکۆی درا» و گوتارێکی د. نسرین فەخری بە ناوی «پاشگر و پێشگری ڤە- وە» بڵاو کراوەتەوە، هەر یەکێکیش لەو گوتارانە ئەو بابەتەن کە تا ئێستا بۆ کەس نەلواوە، ناشلوێت، بیانکات بە نموونەی لێکۆڵینەوە لە هەموو زمانی کوردی. ڕەنگە تەنها جوداوازیەک هەبێ لە نێوان هەڵبژاردنی گوتارەکانی خۆم و ئەو گوتارانەدا ئەوە بێ کە من ویستوومە بابەتی نابەرچاو و حیساب بۆنەکراو بکەمە بنەمای لێکۆڵینەوە. ئەوەی کەوا ڕەنگە لە گوتارەکەی «سوورێکی خامە بە دەوری ڕاناودا» بە پێچەوانەی نابەرچاوبوون حیساب بکرێ، لەوەدا تێهاتۆتەوەکە گوتارەکە ویستوەتی لەگۆشە نیگای خۆیەوە هەڵەی پەرەسەندووی نێوان ڕێزمانشناسانی کوردی لە باسی ڕاناودا ڕوون بکاتەوە.

«...»

---

[10] - خۆم لەم لێژنەیەدا «دەمڕاست - مقرر»م و چەند ساڵێکە لێژنەکە خەریکی ڕێزمانی کوردییە، بەرهەمەکەشی بەم زوانە لە شکڵی کتێبێکدا بڵاو دەبێتەوە.